ئەلیکساندەر سۆلژنیتسین

# ڕۆژێك لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ

و: سولەیمان دڵسۆز

چاپی یەکەم - ٢٠٠٥


**ناوی کتێب: ڕۆژێک لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ**

- نووسینی: ئەلیکساندەر سۆلژنیتسین
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: سولەیمان دڵسۆز
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپی یەکەم بە زمانی ڕووسی: ١٩٦٢ز
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: ٣٢٧
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٢٣- (١٢٦)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت ڕۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**

www.mukiryani.com

کاتی بێدارکردنەوە بوو، وەکو جاران، سەعات پێنجی بەیانی، بە چەکوچ وەردەگەڕانە ئەو پارچە ئاسنەی کە بە پێش بارەگای فەرماندەیی ئۆردووگاوە هەڵواسرابوو. زرینگەی پەیتا پەیتای زەنگەکە لەو دیو شووشەی پەنجەرەکانەوە- کە توێژاڵێکی ئەستووری سەهۆڵ داپۆشیبوون- بە حاڵ دەبیسترا و هەر زوو کپ دەبۆوە. لەدەرێ هەوا سارد بوو و ئێشکگرەکە چیدیکەی چەکوچ لێنەدا.

دەنگەکە بڕایەوە. لەودیو پەنجەرەکانەوە دنیا وەک قیر رەش بوو. وەکو نیوەشەو کە شۆخۆف لە خەو هەستابوو تا دەست بە ئاو بگەیەنێ. بەڵام ئێستا سێ تیشکی زەرد لە دوو چرای قەراغ ئۆردووگا و چرایەکی تری ناو حەوشەڕا جامی پەنجەرەکانیان دەنگاوت.

نەیدەزانی بۆچی کەس نایە دەرگەی خەوگە بکاتەوە. دەنگە دەنگی خزمەتکارەکانیش نەدەهات کە بەرمیلی پێشاویان دادەنایە سەر دەستەکان و دەیانبردە دەرێ.

شۆخۆف پاش ئەوەی لە خەویان هەڵدەستاندن، قەت نەدەنووستەوە. گورج لە جێگاکەی دەهاتە دەر. بەم جۆرە دەیتوانی تا کاتی سەرژمێریی بەیانیان، سەعات و نیوێک بە ئازادی بسووڕێتەوە. بۆ کەسێکی شارەزای ئۆردووگا با، ئەمە دەرفەتێک بوو؛ دەیتوانی بۆ خۆی ملـومۆیەک بکا، دەیتوانی بە بزگوڕی بەرە پاڵتۆ، بۆ یەکێک دەستەوانە چاک بکا. سەردەستەکەیان کە هێشتا لە تەختەکەی نەهاتبووە خوارێ، چەکمە لبادییەکانی بۆ بێنێ و لە کۆڵ ئەوەی بکاتەوە لە چەکمەکانی بگەڕێ کە هەموو جارێ لە گەرمخانەڕا دەیانهێنانەوە. یان دەیتوانی خۆی بە یەکێک لە عەمبارەکاندا بکاو کارێک بۆ خۆی سەروبەر بکا. گەسک لێدانێک، کۆڵکێشی شتێک، یان بچێتە خواردنگە، دەفری سەر مێزەکان کۆ بکاتەوە، لەسەر یەکیان دابنێ و بیانداتە قاپشۆران. ئەمەش رێگایەکی ملـومۆ کردن بوو. زۆر کەس بەو تەمایەوە خۆیان دەگەیاندە خواردنگە. خراپیی ئەو کارە لەوەدابوو، ئەگەر بەرماوێک لە بنی دەفراندا مابایەوە، پیاو بە خۆی نەبوو لێسی دەدان،



بەری نەوسی خۆت پێ نەدەگیرا. بەڵام شۆخۆف هێشتا دەنگی یەکەم سەردەستەی هەر لە گوێیدا دەزرینگایەوە. کۆنە دیلێک کە ساڵی **١٩٤٣** دوازدە ساڵ بوو گیرابوو، جارێکیان لە لێڕەوارێکدا کە داریان دەبڕین، لەبەر ئاگر بە تاقمێک زیندانی، کە یەکسەر لە بەرەکانی شەڕەوە هێنابوویاننە ئۆردووگا-ی گوتبوو: «لە ئۆردووگادا، هەڤالان، یاسای جەنگەڵ حاکمە. بەڵام لێرەش مرۆ دەتوانێ بژی. دەزانی چ کەسانێک پێش هەمووان تێدادەچن؟ ئەوانەی دەفر و کاسان دەلێسنەوە. ئەوانەی بە لاش دڵ بە مالیجەی دکتۆران خۆش دەکەن و ئەوانەی قسە بۆ کاربەدەستان دێنن و دەبەن».

ئەوەی سیخوڕەکانی لێ دەرکەی، قسەکانی هەموو ڕاست بوون. چونکە سیخوڕەکان دەیانزانی چۆن سەولەی خۆیان ببرژێنن و بە نرخی سەری کەسانی دیکەش بووە، کاری خۆیان مەیسەر بکەن.

شۆخۆف هەمیشە کە لە خەویان هەڵدەستاندن، لەجێگاکەی دەهاتە دەر، بەڵام ئەمڕۆ چرتەشی نەکرد. لە شەوێ دیکەوە قالبی خۆش نەبوو، ئازای لەشی کوترابوو و دەیچریکاندو تەزووی پێدادەهاتن. شەوێ ئەختوچاری کرد نەیتوانی خۆی گەرم دابێنێ. لەخەودا هەستی بەوە کردبوو کە خەریکە نەخۆشییەکی پیسی پێوە دەنووسێ. پاشان حاڵی کەمێک باشتر ببوو. بە درێژایی ئەو شەوگارە ئاواتی خواستبوو رۆژ نەبێتەوە.

بەڵام رۆژ ببۆوە، وەکو جاران کە رۆژ دەبۆوە.

بەهەرحاڵ لەم قەیسەرخانە کاول بووەدا چۆن دەیتوانی خۆی گەرم دابێنێ؟ بەو شووشە سەهۆڵ بەستووانە و ئەو زوقمەوە کە لەسەر سەری پیاو، لەو شوێنەی دیوار دەگەیشتە ساپیتەی خەوگە، نیشتبوو.

شۆخۆف هەر لەسەر تەختەکەی بوو. لە تاقی سەرەوەی تەختەکە هەروا کە پەتۆ و پاڵتۆکەی بەخۆی دادابوون و لینگی لە قۆڵی کەوایەکەی کێشابوون، راکشابوو. هیچ کوێی نەدەدی، بەڵام بەو دەنگە دەنگەڕا دەیزانی لەخەوگەدا و لەو قاوشەی لێی دەنوێ چ باسە. زرمەی پێی خزمەتکارەکان دەهات کە بەرمیلەکانیان دەبردنە دەرێ. ئەم جۆرە کارانەیان بە نەقوستانەکان دەکردن و بە کاری ئاسان لەقەڵەم دەدران. بەڵام مەردم دەویست بەرمیلێک بباتە دەرەوەو نەیەڵێ لەسەریەوە بڕژێ. ئینجا یەکێکی دەستەی

حەفتاوپێنج ئەو چەکمانەی لە گەرمخانەوە هێنابوونیەوە دانانە عەرز و دوا بەدوای ئەویشدا، یەکێکی دەستەی خۆشیان هەمان کاری کرد. (نۆرەی دەستەی ئەوانیش بوو چەکمەکانیان بەرنە گەرمخانە.) سەردەستەو یاریدەدەرەکەی بەپەلە چەکمەکانیان هەڵکێشان، تەختەکانیان جیڕەجیڕیان لێوەهات. یاریدەدەری سەردەستە دەبوو بۆ وەرگرتنی جیرەی نان بچێ و سەردەستەش دەچووە بارەگای فەرماندەیی هەتا سەر لە بەشی بەرنامەڕێژیی بەرهەمهێنان بدا.

شۆخۆف بیری کەوتەوە کە چوونی ئەمڕۆی سەردەستە بۆ بەشی بەرنامەڕێژیی بەرهەمهێنان دەگەڵ ڕۆژان جودایە. بۆ ئەوان ئەمڕۆ ڕۆژێکی گرینگ بوو. دەیانگوت بڕیار وایە دەستەی سەد و چوار لە کارگەی بیناسازییەوە بۆ سازکردنی کۆمەڵگایەکی هاوبەش ڕابگوازن.

حاڵی حازر ئەو کۆمەڵگایە لە پارچە زەوییەکەی ڕەق و و رووتی بەفرو سەهۆڵ داپۆشراو زیاتر نەبوو، کە دەبوایە پێش هەموو شتێک هەندێک قوولکەی لێ هەڵقەنن، تیرەگانی تێدا بچەقێنن و بۆ پێشگیری لە ڕاکردنی خۆیان دەورەی بە تێلبەند بتەنن. جا ئەوجا دەیانتوانی دەست بەکاری بیناسازی بکەن.

بێگومان هەتا مانگێکی ڕەبەق لەوێ قوولکەیەکیشیان بۆ خۆ گەرم کردنەوە دەست نەدەکەوت. ئاگر کردنەوەش نەدەلوا. ئاوردوویان لەکوێ هێنابا؟ تاقە ڕێگای ڕزگاربوون ئەوە بوو تا زمانیان دەشکێ کار بکەن.

سەردەستە دڵەڕاوکەی بوو و بە تەما بوو بچێ ئەو کارە لە ئەستۆی خۆی دارنێ و لە ملی دەستەیەکی تری بپەستێوێ، دەستەیەکی وا کە ئەفرادە گێلەکانی لە گوێی گادا خەوتبن. دیارە ئەو کارە بە دەستی بەتاڵەوە نەدەکرا. هیچ نەبێ دەبوو نیو کیلۆ دووگی بەرازی پێبێ و بیداتە بەرپرسی بەرنامەڕێژی.

شۆخۆف ئەگەر ئەمڕۆ سەردانی دەرمانگای کردبا ڕەنگبوو بتوانێ ناوی خۆی بخاتە ناو لیستی نەخۆشان. تاقیکردنەوەی بێ زەرەر بوو. ئازای لەشی دەیچریکاند.

پاشان بیری کردەوە بڵێی پاسەوانی ئەمڕۆ کێ بێ و هاتەوە یادی کە نۆرەی ئیڤان-ی تەڕژیە. گرووبانێکی درێژی ڕەقەڵە کە چاوەکانی دەتگوت مێوژە ڕەشن. زیندانی کە یەکەم جار تووشی دەبوو زەندەقی لێ دەچوو، بەڵام بەرە بەرە کە دەگەڵی ڕادەهاتی بۆت



دەردەکەوت لەوانی تر هێدی و لەسەرەخۆترە. کەوابوو شۆخۆف دەیتوانی تا نۆرە دەگاتە خەوگەی ژمارە نۆ بۆ ئەوەی بچنە خواردنگە، لەسەر تەختەکەی بێ.

***

هەرکە دوو زیندانی پێکەوە ڕاست بوونەوە، تەختەکە لە ناکاو لە جێی خۆی لاچوو و لەرزییەوە. دراوسێی شۆخۆف لە قاتی سەرەوە، ئالیۆشا-ی باپتیست بوو. لە ژێریشیەوە بیۆنۆڤسکی دەخەوت کە سەردەمێک گەمیەوانی هێزی دەریایی بوو.

کابرا ئاسنگەرەکەی دەستەی بیست بەسەریدا گوڕاندن: «هۆی، دەگەڵ ئێوەمە سەگباب، ئەو فڵتە فڵتەتان لە چییە؟» چەکمەیەکی ڕێهاڵاندن و گوتی: «لێی وەبڕن.»

چەکمەکە تلپەی لە کۆڵەگە هێنا. خزمەتکارەکان بێدەنگ بوون. یاریدەدەری دەستەکەی تەنیشتیان بە بۆڵەبۆڵ بە سەردەستەکەیانی گوت: «ڤاسیلی فیۆدۆرۆڤیچ، ئەو زۆڵانە لە عەمبار فێڵیان لێکردووین. دەبوو چوار نانی نۆسەد گرامیمان بدەنێ، کەچی سێیان داوینێ. ئەوشۆ یەکێک نانی کەمتر بەر دەکەوێ.»

سەبر دەدوا ، بەڵام هەموو ئەفرادی دەستە متەقیان لە خۆ بڕیبوو و گوێیان بۆ شل کردبوو. ئەمشەو کێ جیرەی نانی کەمتری بەر دەکەوت؟

شۆخۆف هەروا لە جێی خۆی، لەسەر دۆشەگی ئاخنراو لە بڕەی دار بوو، خۆزگە لایەک وەلایەکی کەوتبا. یان (تا)یەکەی هەڵکشابا، یان چاک ببایەوە. بەو حاڵەی تێیدابوو، لە خۆی نەدەگەیشت.

ئالیۆشا خەریکی نزاکردن بوو. گەمیەوان کە لە ئاودەستخانەڕا دەگەڕایەوە، لە کاتێکدا دیار نەبوو دەگەڵ کێیەتی، بە گاڵتەجاڕییەوە گوتی: «خۆتان قۆنداغ پێچ بکەن، کوڕینە! بەلای کەمەوە سی پلە لەژێر سفردایە.»

شۆخۆف خۆی لە دەسکو بیور نا بچێتە نەخۆشخانە. بەڵام ساتێک دواتر، دەستێک بە پەلە پەتۆ و کەوایەکەی لەسەر لابرد. شۆخۆف ڕاچەنی و لەژێر پاڵتۆکەوە ملی هەڵێنا. لەبەر پێیانی، تاتاری ریوەڵە، کە سەری دەگەیشتە تەختەکەی سەرەوە، ڕاوەستابوو.

کەوابێ ئەمڕۆ ئەو مردەلۆخە ئێشک دەگرێ و بە بێ بەرنامە هاتووە.

کابرای تاتار چاوێکی لەو قەیتانە سپییە کرد کە لەسەر پشتی کەوایەکەی شۆخۆف دوورابوو. ژمارەکەی خوێندەوە: «ئێس-٨٥٤» و گوتی: «سێ رۆژ زیندان بەکارەوە!»

بە بیستنی دەنگە گنە پێکەنیناوییەکەی، هەموو ئەوانەی لە خەوگە بوون، شێوان و وە جموجووڵ کەوتن. خەوگە هێشتا تاریک بوو. (چراکانیان هەموو هەڵنەکردبوون) دووسەد زیندانی لە سەر پەنجا تەختی چوار نهۆمی دەخەوتن. ئەوانەی هەڵنەستابوون بە تاڵووکە دەستیان بە خۆ دەبەرکردنەوە کرد.

شۆخۆف بە دەنگێکی ئێجگار بەستەزمانانەوە گوتی: «ئاخر بۆچی، برای پاسەوان»[1]. گیران بە کارەوە زۆریش ناخۆش نەبوو. چێشتی گەرمیان دەدایەی و پێت نەدەکرا سەری خۆشت بخورێنی. گیرانی راستەقینە ئەوە بوو پیاو ئیزنی ئەوەی نەبێ لە چوار دیواریی سلوول بچێتە دەرێ.

تاتارەکە بە بێوازییەوە گوتی: «بۆ هێشتا لە جێگاکەت نەهاتوویە دەر؟ وە پێشم کەوە بۆ فەرماندەیی..» بۆ خۆشی و شۆخۆفیش و ئەوانی تریش دەیانزانی دەیباتە کوێ.

چاوی تاتارەکە لە ناو روخسارە چرچو لۆچ و بێ تووکەکەیدا نیگایان مات بوو. چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا تا پەنجە بۆ زیندانییەکی تر رابکێشێ. بەڵام هەموویان-چ ئەوانەی لەبەر شۆقی چرا بوون و چ ئەوانەی لە پەنا و پەسیوە تاریکەکانی خەوگەدا لەسەر تەختی سەرەوە یان بنەوە دەخەوتن- خەریکی لەبەرکردنەوەی پانتۆڵەکانیان بوون، پانتۆڵی تۆخی دووبەر کە ژمارەی زیندانی بە سەر ئەژنۆی چەپیانەوە دوورابوون. یان جلەکانیان پۆشیبوون و ئێستا قۆپچەی شەرواڵەکانیان دادەخستن و بە لەز بەرەو دەرگا دەڕۆیشتن تا پێش ئەوەی تاتارەکە خەوگە جێ بێڵێ، لەوێ وەدەرکەون.

شۆخۆف ئەگەر بەهەق گیرابا، زۆر پێ تێک نەدەچوو، ئەو داخە دەیکوشت هەمیشە پێش هەمووان لە خەو رادەبوو. بەڵام دەربازبوون لە چنگی ئەو تاتارە مەحاڵ و دەنگ کردن بێ کەڵک بوو. پانتۆڵەکەی دەپێ کرد. سەر ئەژنۆی چەپی بە پارچە پەڕۆیەکی چڵکن پینە کرابوو کە ژمارە کاڵ بۆوەکەی ٨٥٤ی نیشان دەدا. کەوایەکەشی دەبەرکرد. (کەوایەکەی لە دوو جێگایانەوە ژمارەی پێوەبوو، لەسەر سنگ و پشتی) چەکمەکانی لەناو کۆڵی چەکمان هەڵگرتن. کڵاوەکەی لەسەرنا (ژمارەکە، بە ژوور دەمامکەکەیەوە دوورابوو)و وە دووی تاتارەکە کەوت.



هەموو ئەفرادی دەستەی سەد و چوار بردنی شۆخۆف-یان بینی، بەڵام کەس متەقی نەکرد. بێکەڵک بوو. چیان پێ دەگوترا؟ سەردەستە کە دەبوو پشتگیری لێ بکا لەخەوگە نەبوو، شۆخۆف-یش هیچی بەکەس نەگوت. نەیدەویست تاتارەکە بهارووژێنێ. پێویست نەبوو هیچ بە هاوەڵەکانی بڵێ، خۆیان ناشتاکەیان بۆ رادەگرت. دوو بە دوو وەدەر کەوتن.

***

هەوای دەرێ تۆف و بەند و بەستەڵەک بوو، مژ پشووی لە پیاو دەبڕی. تیشکاوێژەکان لەسەر بورجەکانی دیدەوانییەوە، لە گۆشەو سیلەی حەوشەکەڕا وڵاتیان رووناک دەکردەوە. چراکانی قەراغ و نێو ئۆردووگا هەموو دایسان و لەبەر تیشکی بەلێشاویان ئەستێرەی ئاسمانێ بزر ببوون.

زیندانییەکان لە کاتێکدا بە چەکمە لبادییەکانیان شەقڵیان لە بەفر دەکرد، هەر کام بەرەو شوێنێک وەڕێ کەوتبوون. دەچوونە ئاودەستخانە، عەمبارەکان، بەشی ئەمانەتییەکان، یانژی دەچوونە چێشتخانە تا خەریکی چێشت لێنان بن. هەموو خۆیان کروشم هەڵێنابوو و ملیان بردبوونەوە ناو ئێخەی پاڵتۆکانیانەوە. سەرما تا سەر ئێسکان دەیسمی و ئەو بیرە کە دەبێ رۆژێکی تەواو لەبەر ئەو سەرمایە بن پەرەی بە هەستی سەرمایەکە دەدا. بەڵام تاتارەکە بەخۆی و ئەو شڕە پاڵتۆیەیەوە کە سەرشانە شینەکانی کاڵ ببوونەوە، قورس و قایم هەنگاوی دەنان و دەتگوت سەرما هیچ کاری تێناکا.

حەساری دارین و بەرزی زیندانیان بەجێ هێشت. (زیندان تاکە خانووی لە خشت دروستکراوی ئۆردووگا بوو) لەو تێلدڕکەی بەدەوری نانەواخانەدا کێشرابوو، تێپەڕین و گەیشتنە سیلەی بارەگای فەرماندەیی، ئەو جێیەی کە کوتە ئاسنێکی خووس لێنیشتوویان بە تێلێکی ئەستوور لە دارتێلێک خستبوو. لە دارتێلێکی دیکەش تێپەڕین کە تین پێویان بەلای سەرەوەی هەڵواسیبوو. بۆئەوەی پلەکەی زۆر دانەبەزێ لە نێو سندووقێکیان نابوو. شۆخۆف بە ئومێدەوە لە ژێلاڕا چاوێکی لە لوولە سپییەکەی کرد. ئەگەر چل و یەک پلەی نیشان دابا، بۆ کار نەیاندەبردنە دەرێ. بەڵام ئەمڕۆ پلەکە بەتەمای دابەزین نەبوو.

له بارەگای فەرماندەیی ئۆردووگا یەکسەر چوونە ژووری ئێشکگری. وێدەچوو– هەروەک له رێگایە مەزندەی کردبوو– بە تەمای گرتنی نەبن. تەنیا ژووری ئێشکگری، عاردەکەی پیس ببوو و یەکێک دەبوایە خاوێنی کاتەوە. تاتارەکە گوتی بەڕەڵلات دەکەم و لە سەریشی کرد عەردی ژوورەکە بسڕێتەوە:

شۆردنەوەی ژووری پاسەوانی لە ئەستۆی زیندانییەکی تایبەتی بوو– خزمەتکاری ناوەندی فەرماندەیی کە لەدەرەوەی ئۆردووگا کاری نەدەکرد. بەڵام پاش ئەوەی ماوەیەک لە ناوەندی فەرماندەییدا مایەوە، ئیتر ئەوێی بە ماڵی خۆی دەزانی و هەر هۆدەیەکی حەزی لێبایە، لە نووسینگەی ئەفسەری نیزامییەوە بگرە تا هی ئەفسەری ئاسایش (کە زیندانییەکان پێیان دەگوت باوکی دان پێداهێنەر) سەری دەکێشاو هەندێ جار قسەی ئەوتۆی گوێ لێدەبوون کە تەنانەت پاسەوانەکانیش بەر گوێیان نەدەکەوت. وردە وردە خۆی لێگۆڕا و خاوێن کردنەوەی ژووری پاسەوانە ئاساییەکانی پێ قاڕ بوو. پاسەوانەکان یەک دوو جاریش بە دوویاندا نارد، تا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە وا چاکە بۆ خاوێن کردنەوەی ژوورەکەیان زیندانیی تری ئۆردووگا بێنن.

ئاوری سۆبەی ژوورەکە بڵێسەی دەدان. دوو کەس لە پاسەوانەکان کە خۆیان لێ رووت کردبۆوە، بە توێی فانیلەیەکی چڵکن و بۆرەوە شەترەنجیان دەکردو کەسی سێیەم بە پاڵتۆ و چەکمەوە لەسەر کورسییەک تخێڵ ببوو. سەتڵ و پەڕۆکێک لە قولنچکێکی ژوورەکە دەبینران.

شۆخۆف کە زانی بەر دەبێ دڵی خۆش بوو و بە تاتارەکەی گوت: «زۆر سوپاس، برای پاسەوان، لەمەودوا درەنگ لە خەو هەڵناستم».

لێرە ئەرکی زیندانی سانا بوو. کارەکەی خۆت دەکرد و دەچوویە دەر. شۆخۆف کە ئێستا دەبوو کارێک بکا، دەتگوت قالبی خۆشترە. سەتڵەکەی هەڵگرت و بە دەستی رووتەوە بەرەو بیرەکە چوو. کە لە خەوگە وەدەر کەوتبوو لە پەلەپەلییان دەستەوانەکانی لە ژێر بالیفەکەی لێ بەجێمابوون.

سەردەستەکان لە کن دارتێلەکە لێک خڕ ببوونەوە تا راپۆرتەکانیان بدەنە بەشی بەرنامەڕێژی. یەکێکی هەرە لاویان کە سەردەمانێک قارەمانی یەکێتی سۆڤییەت بوو،



وەسەر دارتێلەکە کەوت و تین پێوەکەی بەدەست پاک کردەوە. ئەوانی دی کردیانە هەڵڵا: «ئاگات لە هەڵمی زارت بێ. هوو مەکە سەر تین پێوەکە، پلەکەی هەڵدەکشێ.»

«بە هەناسەی من هەڵدەکشێ؟ ئەو سەگباب خێوە لە جێی خۆی چرتەش ناکا.»

تیۆرین–ی سەردەستەی شۆخۆف–یان لەگەڵ نەبوو.

سەتڵەکەی دانا و دەستی بردنە نێو قۆڵەکانییەوە. راوەستابوو تا بزانێ کاری سەردەستەکان بەکوێ دەگا.

ئەو سەردەستەیەی وەسەر دارتێلەکە کەوتبوو بەدەنگێکی نووساو گوتی: «بیست و حەوت و نیو خوارەوەی سفر، سەگی تێڕی!»

بۆ دڵنیایی جارێکی تریش سەیری تین پێوەکەی کردەوەو دابەزی. یەکیان گوتی: «هەر وایە هەمیشە هەڵەی نیشان دەدا. ئەو ماڵخومردە قەت نەبوو راستی بڵێ. ئاخر تین پێوێک جوان کار بکا، لێرەی دانانێن!»

سەردەستەکان بڵاو بوون. شۆخۆف بەرەو بیری ئاوەکە دایقەڵاشت. کڵاوەکەی داکێشابووە خوارێ، بەڵام داینەخستبوو و گوێچکەکانی لە سەرمان سوور هەڵگەڕابوون.

زارکی بیرەکە سەهۆڵێکی ئەستووری بەستبوو. بە جۆرێکی وا کە سەتڵەکەی بە زەحمەت تێوە دەچوو. گوریسەکەی ناو دەستیشی وەک کۆڵکەی لێهاتبوو. بە دەستە لەگۆ چووەکانی سەتڵە ئاوەکەی هێنایەوە ژووری ئێشکگری کە هەر هەڵمی لێ هەڵدەستا.

تاتارەکە لەوێ نەبوو، بەڵام ئێستا چوار پاسەوان لە ژوورێ بوون. دوو پاسەوانی گۆڕین دەستیان لە شەترەنج هەڵگرتبوو و ئەو پاسەوانەی بە شمەکەوە نووستبوو، هەستابوو و لەگەڵ ئەوانی تر لە سەر جیرەی هەرزنی مانگی ژانویە دەمەقاڵەی بوو. (لە ئاوایی کرێکارانی ئازاد[٢]دا قاتوقڕیی خواردەمەنی بوو و گەرچی بیتاقەی خۆراک هەڵگیرابوون، بەڵام هێشتا کاربەدەستەکان دەیانتوانی هێندێک لەو خۆراکانە بە داشکانەوە لە فرۆشگاکان بکڕن.) یەک لە پاسەوانەکان گوتی: «ئەو دەرگەیە پێوەنێ رەشەولاغ! ساردە.»

***

بەیانان چەکمەکانت تەڕ بان کارت کرابوو. ئەگەر خۆشت گەیاندباوە خەوگە تا بیانگۆڕی چەکمەی ترت دەست نەدەکەوت. شۆخۆف لەو هەشت ساڵەی گرتووخانەدا هەموو چەشنە چەکمەو پێڵاوێکی دیتبوو.

سەردەمایەک بە درێژایی زستان بە بێ چەکمەی لبادیان رابواردبوو، وەختایەک تەنانەت چەکمەی ئاساییشیان نەدابوونێ. سۆلی لە پێلکی داری (غان) دروست کراویان لە پێ دەکردن، یان ئەو پاتەی لە تیتۆڵە جیری کارخانەی تراکتۆرسازیی «چیلیلبینسک» دروست دەکران و پێیان دەڕۆیشتی شقڵی پێت لەسەر زەوی بەجێ دەما. ئێستا رەوشەکە باشتر ببوو. مانگی ئۆکتۆبەر، لە سایەی سەردەستەکەیان کە بە خێرا خۆی بردبوویە فرۆشگا، شۆخۆف ببووە خاوەن جووتە چەکمێکی قایش کە سەرپەنجەیان خڕ و کوشاد بوو و دەکرا بە دوو پێپێچانەوەیان لە پێ کەی. تا حەفتەیەک دەتگوت خوا خەنی کردووە، دەچووە ئێرو ئەوێ و بە کەیفسازی پانیەی چەکمەکانی لێک دەدان. لە مانگی دیسەمبەردا چەکمەی لبادیشیان دانێ و هەر بە جارێ شاگەشکە بوو. پیاو حەزی نەدەکرد بمرێ. بەڵام زۆڵێکی بێ دای و باب لە نووسینگەدا وەبەر گوێی فەرماندەی ئۆردووگای هەڵخوێند کە وا باشترە ئەو چەکمە لبادییانە بدرێنە کەسانێکی وا کە چەکمەی تریان نەبێ. زیندانی نەدەبایە دوو جووت چەکمەی پێکەوە هەبن. ئەوجا شۆخۆف سەر پشک بوو، یا دەبوو ئەو زستانەی بە چەکمە نوێیەکانی خۆی بە سەر بردبا، یان لە جیاتیان چەکمەی لباد وەرگرێ و تا توانەوەی بەفر و شەختەی بەهارێ لە پێیان کا. جا چەند بە دڵسۆزییەوە چەکمەکانی پاراستبوون و چەوری کردبوون تا رەق هەڵنەیەن! لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی ژیانی ئۆردووگا، هیچ شتێک بە قەد لەدەست دانی ئەو چەکمانە پەژارەی نەخستە دڵ. چەکمە قایشەکانی لە نێو لیژەی چەکماندا رزین و پوان، بەهار هات و رابرد و شۆخۆف هەرگیز چاوی پێ نەکەوتنەوە.

رێگا چارەیەکی بە مێشکیدا هات. بە پەلە چەکمەکانی داکەندن و لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا جێی بۆ کردنەوە. پێپێچەکانیشی لەسەردانان، (ئەو کەوچکەی دایمە لە نێو چەکمەکانیدا دەیشاردەوە بە ترینگ و هۆڕ کەوتە زەوی. بەو پەلەپەلەشەوە کە لە خەوگە وەدەرکەوتبوو کەوچکەکەی لەبیر نەچووبوو) ئینجا بە پێخواسی ملی لە شۆردنەوەی ژوورەکە نا. ئەو ئاوەی رشتبووی گەیشتە بن چەکمەی پاسەوانەکان.



یەک لە پاسەوانەکان کە ئاگای لە شۆخۆف بوو، گوتی: «هۆی، دەگەڵ تۆمە بۆگەنیو، زۆر توندی مەگرە!» و لینگی هەڵێنان.

... «برینج؟ بەڵام برینج شتێکی ترە، دەگەڵ هەرزن خوایان یەکە.»...

«ئەو هەموو ئاوە بۆ خەسار دەکەی، حەپۆل؟ ژوور شۆردنەوە وا دەبێ؟»

«چارە نییە، برا، ئەو چڵک و کەمرەیە وا نەبێ ناخووسێ.»

«تولە باب، قەتت ژنەکەت نەدیوە چۆن ژوورێک دەشواتەوە؟»

شۆخۆف هەروا کە پەڕۆکەکەی بەدەستەوە بوو، راست بۆوە. بێئاگا بزەیەکی هاتە لێوان و جێی بەتاڵی کەڵپی وەدەر کەوتن. ساڵی ١٩٤٣ لە «ئوست–ئیژما»[٣] چەند ددانی بە نەخۆشیی ئەسکۆربۆت هەڵوەریبوون، زۆری نەمابوو بەو نەخۆشییە بچێ. خوێنی دادەنا و هێند لەڕ ببوو هیچی بە زگیەوە گیر نەدەبوو. بەڵام ئێستا تەنیا دەمێکی بێ ددان و زمان گیرانێکی گاڵتەجاڕانەی لەو دەمانە بۆ بە یادگار مابۆوە.

«ساڵی چل و یەک لە ژنەکەمیان هەڵبڕیم، برا، تەنانەت وەبیرم نەماوە شێوەشی چۆن بووە.»

«بڕۆنێ، چۆن عەرز دەشواتەوە... ئەو زۆڵانە نە خۆ دەدەنە کار، نە دەماریشیان هەیە. حەیفە نان بخۆن، دەبوو گوویان بدەنێ.»

«جا با هەموو رۆژێ بیشۆنەوە، کەڵکی چی هەیە؟ ئەو ژوورە دایم و دەرهەم تەڕو برە، چاو، دەگەڵ تۆمە، زیندانیی ٨٥٤، هەر بە ئاستەم پەڕۆیەکی تەڕی رێخە، با نەزەلێ، دوایەش ملی خۆت بشکێنە و بڕۆ.»

... «نا، برینج لە کوێ، هەرزن لە کوێ!؟»...

شۆخۆف بە کونفەیەکوونێک لێبۆوە. دوو جۆر کارکردن هەیە. ئەگەر بۆ ئینسانان بێ چۆن چاکە کارەکە ئاوها دەکەی، دەنا بۆ وڵاخان، وا باشە هەر دەمەلاسکەی کارکردن بکەیەوە، ئەگەر وانەبا زیندانی تا ئێستا حەوت کفنیان رزاندبوون، کەس گومانی لەوەدا نەبوو.

پەڕۆی تەڕی لە هەمووی خشاند، بە جۆرێکی وا لەو ژوورەدا جێگای وشکی

نەهێشتەوە. بێ ئەوەی پەڕۆیەکە هەڵگوشێ لە پشت سۆبەکەی هاویشت. چەکمەکانی دە پێ کردنەوە. ئاوی سەتڵەکەی لەو ڕاڕەوەی کە کاربەدەستانی بالاَ هاتوچۆیان پێدادەکرد، وەرگێڕا و لابڕ خانووی حەمام و هۆڵی تاریک و ساردی یانەی بەجێ هێشت و بەرەو خواردنگە بۆوە.

دەبوو سەرێکی دەرمانگاش بدا. هەموو لەشی وە ژان کەوتبۆوە. نەدەبوو بە بەر چاوی پاسەوانی خواردنگەدا بێ. فەرماندەی ئۆردووگا فەرمانێکی توندوتیژی دەرکردبوو کە هەر زیندانییەک بە بێ کار بخولێتەوە، بیگرن.

ئەمڕۆ بەر دەرکی خواردنگە چۆڵ و هۆڵ بوو (کەم وا هەڵدەکەوت). بێ سێ و دوو خۆی بە ژووریدا کرد.

خواردنگە بەو تەزووە سەرمایەی لە کەلێنی دەرگەکانڕا دەهات و ئەو هەڵمەی لە قاپە شێوەکان هەڵدەستا، وەک حەمامی لێهاتبوو. مێزەکان هەموو گیرابوونەوەو کەسانێکیش لە بۆسەی چۆڵ بوونیاندا بوون. دوو یان سێ زیندانی لەهەر دەستەیەکەوە بە سینیی دارینی پڕ لە شێو و شلکێنەوە بە هەراو هوریا دڕیان بە ئاپۆرەکە دەدا و لە مێزی بەتاڵ دەگەڕان. لەو کاتەدا هەرچەند نەڕاندبات کەس گوێی لە دەنگت نەدەبوو. وەک ولاَخان چەقی ڕێگایان دەگرت و شانیان وەبەر هەڵدەدای، دەشقەم سینیەکەت لێبکەوێ و ئەوانیش تێی وەرووکێن. دەبوو بە دەستە بەتاڵەکەت دە پاش ملیان بسرەوێنی تا ڕێگات بەردەن. چارەی دیکەت نەبوو.

لەوبەری مێزەکە چاوی بە جحێڵۆکەیەک کەوت کە پێش ئەوەی شێوەکەی بخوا خاچی لەسەر سینگی خۆی کێشایەوە. بێگومان خەڵکی ئۆکرانیای ڕۆژئاوا بوو و تازە هاتبوو.

رووسەکان هەر لە بیریشیان نەمابوو بە کام دەست لە سەر سینگیان خاچ بکێشنەوە.

خواردنگەکە ساردو سڕ بوو. زۆربەی زیندانییەکان کلاَویان لە سەر بوو، بە سەرنجەوە لەنێو گەلاَ کەلەمەکاندا لە وردە گۆشتی ماسی دەگەڕان و دڕووی ماسییان تف دەکردەوە سەر مێزەکە. کاتێ سەر مێزەکە پڕ دەبوو لە دڕووی ماسی، پێش ئەوەی دەستەیەکی دی بێ، یەکێک لەسەر مێزەکە کۆی دەکردنەوەو دەیهاویشتنە بەر پێیان. تف کردنەوەی دڕووی ماسی لەسەر زەوی عەیب بوو. لە نێوەڕاستی هۆڵی خواردنگەدا دوو ئەستوندەگی



کۆڵەگە ئاسا دەبینران کە لە پەنا یەکیان فتیۆکۆف، هاودەستەی شۆخۆف دانیشتبوو و سێرەی لە تێشتەکەی وی گرتبوو. لەناو دەستەی سەد و چواردا کەس جامینی فتیۆکۆف-ی نەدەویست، تەنانەت لە شۆخۆف-یش دەترسا. بە رواڵەت هەموو وەک یەک وابوون، بەلاَم لە ناو ئەو پاڵتۆیانەدا ئادەمزادی جیاواز بوون. نەدەکرا بە بیۆنۆفسکیی گەمیەوان بڵێی قاپە شێوەکەت بۆ ڕاگرێ. هەندێ کاری وا هەبوون تەنانەت شۆخۆف-یش نەیدەکردن. کاری ئەوتۆ کە پێی قاڕ بوو بیانکا. فتیۆکۆف چاوی پێکەوت، هەناسەیەکی هەڵکێشاو هەستا.

«تێشتەکەت سارد بۆوە. خەریک بووم لە باتیانت بیخۆم. پێم وابوو لە کونەڕەشەیان ئاخنیوی.»

فتیۆکۆف کەوچکەکەی لە چەکمە دەرێنا. گیانی لە قوونی ئەو کەوچکەدابوو. تەواوی ئەو ماوەیەی لە باکوور بوو ئەو کەوچکەشی پێبوو. بەخۆی لە پارچە فافۆنێکی دروست کردبوو. لەسەری هەڵکەندبوو: «ئوست-ئیژما-١٩٤٤».

هەواشی ساردبوو، بەلاَم شۆخۆف ئەو کەللە تاشراوەی لێ رووت کرد. قەت بە تەپلەوە نانی نەدەخوارد. شێوە ساردو سڕەکەی بە ملاَک تێک وەردا و لە قاپەکەی ورد بۆوە تا بزانێ چی بەرکەوتووە؟ هەر وەک جاران بوو. لە سەرەوەی مەنجەڵیان تێکردبوو و لە خەستو خۆڵیی بنەوەی هیچ تێدا نەبوو. قاپی شێو نەدەبوو بکەوێتە بەر دەستی فتیۆکۆف، پەتاتەکانی لرف دابوون.

چێشتی ئۆردووگا بەوە چاک بوو هەمیشە گەرم بوو، بەلاَم ئێستا شێوەکەی شۆخۆف سارد ببۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەک هەموو جارێ، بە کاوەخۆ و دیقەتەوە خواردی. تازە ساپیتەش ئاوری تێبەر بیا، مێشی لێ میوان نەبوو. بێجگە لە کاتی خەوتن، تەنیا دە دەقـقە بۆ خواردنی بەرچای، پێنج دەقـقە بۆ پشووی نیوەڕوانێ و پێنج دەقـقەش بۆ خواردنی شێف لە کۆڵ زیندانی دەبوونەوە.

خواردنەکە ساڵەو ساڵ نەدەگۆڕا. بۆ زستان هەچ گیایەکی وشکیان کردبایەوە هەر ئەویان وێ دەگێڕا. ساڵی پێشوو تەنیا گێزەری سوێریان دەدانێ و لە مانگی سپتەمبەر تا ژووئەنیش لە گێزەر بترازێ چێشتەکە هیچی تێدا نەبوو. زستانی ئەوساڵ کەلەمی

رەشیـان هەبوو. باشـترین مـانگی سـاڵ ژووئەن بوو کـە سـەوزەوات دەبڕا و سـووپی گـەنمە کوتاویان بۆ لێدەنان. ناخۆشترین مانگ ژووئیە بوو کە قارکی گەزگەزکەیان بۆ لە چێشت دەکردن.

مـاسی تەنیـا مـۆغـەرە و دڕووەکـەی لێ دەمـایەوە. سـەر و کلکیـشی نەبێ، گـۆشـتـەکـەی دیکەی هەموو لە مەنجەڵدا دەتوایەوە. شۆخۆف پووڵەکە و مسقاڵە گۆشتێکیشی کە بە دڕووەکـانەوە دەنووسـا ، بە خـەتەر نەدەدا. ئێـسک و دڕووەکـانی دەجـوین و دەیمێشتن و دەیتـفاندنەوە سەر مێـزەکە. دە سەر هیچ شتێکی ماسییـەوە نەدەچوو. تەنانەت کلک و گـوێچکەکـەشی دەخـواردن. چاوەکـانیـشـی، ئەگـەر مـابان، دەخـواردن. تەنیـا ئـەگـەر لە قوولکەی چاو هاتبانە دەرێ و بە نێو چێشتەکەدا مەلەیان کردبا ، لێوی لێنەدەدان. هەموو بەو کارەی پێدەکەنین.

شۆخۆف ئەمڕۆ پاشەکەوتێکیشی هەبوو. جیرەی نانەکەی لە خەوگە وەرنەگرتبوو و ئێستا تێشتەکەی بێ نان دەخوارد. نانەکە هەمیشە هەروا بە وشکیش دەخورا. دوایە دەکرا زگی خۆی پێ تێر بکا.

چێشـتـێکی دی سووپی «ماگارا» بوو کـە لە سندە گڵێکی سـارد دەچوو بە کەوچک ورد کرابێ. بەگەرمی چ تامی لێنەدەهات و بەری دڵی مرۆی نەدەگرت، جا بە ساردی تێفکرە چۆن بوو! مـاگـارا شـتـێکی وەک هەرزن وا بوو کـە لە باتی گـەنم لە شێـویان دەکـرد. دەیانگوت لە چینڕا دەیهێنن. قـاپێکی پڕی، دووسـەد گـرام دەهاتەوە. خـۆراکی مـرۆیان نەبوو ، کەچی لە جیاتی سووپ دەرخواردی زیندانییان دەدا.

کەوچکەکەی لێستەوەو لە چەکمەکەی راکرد. تەپلەکەی لەسەر نایەوەو بەرەو نەخۆشخانە وەڕێ کەوت.

***

هەوا هەروا بوو؛ ئەستێرەکان لەبەر تیشکی چراکانی ئۆردووگا رەنگیان پەڕیبوو. ئەو دوو تیشکاوێژە شۆقیان لە سەرانسەری گۆڕەپانەکە دەدا.

کە تازە ئەو ئۆردووگایە (ئۆردووگای تایبەت)[٤]یان دروست کردبوو، پاسەوانەکان هێشتا وەک سەردەمی شەڕ زۆریان شینگڵ لەخۆ دەدان.



هەموو جارێ کە کارەبا دەبڕا، بەفیشەکی گڕدار تەقەیان دەکرد. گوللەی سپی، سەوز، سوور، دەتگوت سەردەمی شەڕە. دواتر وازیان لەو کارانە هێنا. رەنگە بۆ ئەوان زۆری تێچووبێ.

هەوا هەروەک کاتی بێداربوونەوە تاریک و تنووک بوو. بەڵام زیندانیی کارامە بە مەزندە دەیزانی وەختی سەرژمێریی بەیانی نزیک بۆتەوە. وەرگێڕکەی خزمەتکاری خواردنگە (خزمەتکاری خواردنگە گێڕ بوو کە لە سەر گیرفانی خۆی وەرگێڕکەیەکی راگرتبوو) چووبوو زیندانیانی خەوگەی ژمارە شەش بۆ بەرچایی وەخەبەر بێنێ.

خەوگەی ژمارە شەش نەقوستانی لێ دەخەوتن، هەروەها ئەو کەسانەش کە لە دەرەوەی ئۆردووگا کاریان پێنەدەکرا. نیگارکێشێکی پیر کە ردێنێکی تەنکی هەبوو بە شەلە شەل بەرەو بەشی پەروەردەو فـەرهەنگ دەڕۆیی تا بـۆ نووسـینەوەی ژمـارەی سـەر بەرگی زیندانییەکان فڵچەو رەنگ وەربگرێ. جارێکی دی تەرح و دیداری کابرای تاتار پەیدا بۆوە کە بە قەڵەمبازان بەرەو فەرماندەیی دەچوو. حەوشەکە چۆڵ و هۆڵ بوو. لێرەو لەوێ زیندانی لە ژێر ئەنوایان خزیبوون تا لەو دوا ساتە شیرینانەی بەر لە کاری رۆژانەدا، خۆیان گەرم بکەنەوە.

شۆخۆف لە ترسی تاتارەکە خۆی لە پەنا دیواری خانوویەک گرت. ئەوچەل لە داوی هەڵەنگوتبا ، قوتاربوونی مەحاڵ بوو. بێ لەوەش لە ئۆردووگادا مرۆ دەبێ هەمیشە بە چوار چاو ئاگاداری دەوروپشتی خۆی بێ. دەبوو وریا بی ئێشکگرەکان لە داوت نەخەن. ئەوان هەمیشە لە یەکێکی وا دەگەڕان بێگارێکی پێبکەن و ئەگەر لە خەو هەستابان بێ سێ و دوو لە حەپسی تاکەکەسییان دەکردی. لە خەوگە رێسایەکی نوێیان خوێندبۆوە، بەپێی ئەو رێسایە زیندانی دەبوا پێنج شەقاوی بۆ پاسەوان بمێنن تەپلەکەی داگرێ و تا پاسەوان دوو هەنگاوی لێ تێنەپەڕێ، بۆی نییە لە سەری بنێتەوە. پاسەوانی وا هەبوون بێ ئەوەی وەڕووی خۆیان بێنن و سەیری زیندانی بکەن، بە پەنایدا تێدەپەڕین. بەڵام هەشبوون بە غافڵگیر کردنی زیندانی شاگەشکە دەبوون. گەلێ زیندانی لەسەر ئەو تەپلە داگرتن و لە سەرنانەوەیە کەوتبوونە ئینفرادی. نا ، هەروا چاک بوو خۆیان لێ لادەی.

تاتارەکە دوور بۆوە و شۆخۆف خەریک بوو بەرەو نەخۆشخانە بڕوا کە لە پڕیکا وەبیری هاتەوە زیندانییەکی خەڵکی لاتفیا[٥] لە خەوگەی ژمارە حەوت پێی گوتبوو ئەمڕۆ پێش

سەرژمێریی بەیانی بۆ کڕینی توتن سەری لێهەڵێنێ. بەڵام شۆخۆف بیری ئەوەندە هاڵۆز بوو، بە جارێ ئەوەی لە بیر چووبۆوە. لاتڤییەکە دوێشەو کیسە توتنێکی زلی بۆ هاتبوو کە زەحمەت بوو تا سبەینێ پەلکێکی لێ وەمێنێ. تا مانگێکی دیکەش توتنیان بۆ نەدەنارد. توتنەکەشی خۆش بوو، نەرم و بۆندار.

شۆخۆف دڵی دە خێڵەوە هات. بڕستی لە ئەژنۆیان بڕابوو. ئاخۆ دەیتوانی سەردانی خەوگەی ژمارە حەوت بکا؟ بەڵام تازە دوور و نزیکی دەرمانگا ببوو، بۆیە بە پلیکانەکانی هەڵگەڕا. بەفر لەژێر پێی کرپەی دەهات.

ڕاڕەوی نەخۆشخانە پاک و خاوێن بوو، وەکو جاران. هێند پاقژ بوو شۆخۆف نەیدەوێرا پێی تێبنێ. دیوارەکانی سپیکارییەکی وەک شووشە وابوون و مێزو کورسییەکانیش هەروا سپی بوون.

دەرگەی ژووری نووسینگە داخرابوو. پزیشکەکان هێشتا لەخەو هەڵنەستابوون. یاریدەدەرێکی پزیشک کە لاوێک بوو بە ناوی نیکۆلای ڤدۆڤشکین، لە پشت مێزێکی خاوێن و ڕێک و پێک لە ژووری خزمەتکارەکان دانیشتبوو، ئاودامانێکی لەبەردابوو دەتگوت بەفری یەکشەوەیە. خەریکی نووسینی شتێک بوو.

کەسی تری لێنەبوو.

شۆخۆف تەپلەکەی داگرت: دەتگوت بەرامبەر بە کاربەدەستێک ڕاوەستاوە. چەشنی زیندانییەکی فەقیرۆکە، وای دەنواند تەماشای نووسینەکانی ناکا. بەڵام نەیدەتوانی سەیری ئەو شتە نەکا کە نەدەبا بیبینێ. ڤدۆڤشکین بە خەتێکی جوان و دێڕی ڕاست شتێکی یادداشت دەکرد. هەر دێڕێکی ڕاست لە ژێر دێڕی تر و بە مەودایەکی وەک یەک لەسەر پەڕی کاغەزەکەو بە پیتی درشت دەست پێدەکرد. شۆخۆف بە سیلە چاوێک تێگەیی ئەو نووسراوەیە فڕی بەسەر کاروباری ئیدارییەوە نییە.

شەرمنۆکانە، وەک ئەوەی سواڵی شتێک لە نیکۆلای بکا، گوتی: «نیکۆلای سیمۆنۆڤیچ.. گوێ بگرە، من نەخۆشم...» نیکۆلای سەری لەسەر کاغەزەکە هەڵگرت. بە چاوی مات و بێحاڵەتەوە سەیری کرد. ژمارەی نیکۆلای لەبەر ئاودامانە سپییەکەی دیار نەبوو.

«ئەدی بۆ ئێستا دێی؟ دوێنێ شەوێ بۆ نەهاتی؟ خۆت دەزانی بەیانیان نەخۆش



وەرناگرین. دەمێکە ناوی نەخۆشەکانمان داوەتە بەشی بەرنامەڕێژی.»

شۆخۆف ئەوانەی هەموو دەزانین و دەشیزانی ئەگەر دوێنێ شەوێش هاتبا هەر وایان پێدەگوت.

«بەڵام نیکۆلای.. سەری شەو کە دەبوو بێم، ئەو دەم حاڵم خراپ نەبوو.»

«ئەی ئێستا نەخۆشی.. کوێت دێشێ؟»

«ئەگەر ڕاستت دەوێ جێگایەکی تایبەتیم نایەشێ، بەڵام هەموو لەشم کوتراوە.»

شۆخۆف لەو کەسانە نەبوو کە پەیتا پەیتا خۆیان نەخۆش دەکردو هەمیشە لە دەرمانگا بوون. نیکۆلای ئەمەی چاک دەزانی. بەڵام بەیانیان دەیتوانی پشوودان بۆ دوو کەس بنووسێ و بۆ دوو کەسەکەشی نووسیبوو. ناوی دوو زیندانییەکە لە لیستی نەخۆشاندا لەژێر شووشە سەوزەکەی سەر مێز دەبینرا. هێڵیان بە بندا کێشابوون.

«دەبوو زووتر هاتبای. بەرەبەری سەرژمێری هاتووی، بەخۆڕاییە. مەحاڵە. ها بگرە بزانم.»

یاوگرێکی لە شووشە دەرهێنا. ئاوەکیی دژی چڵک کردنی لە سەری پاک کردەوەو دایە شۆخۆف. شۆخۆفیش لە ژێر هەنگڵی خۆی نا.

شۆخۆف لەسەر نیمکەتێکی پەنا دیوارەکە دانیشت. بەئاستەم قوونی وەسەر لێوی نیمکەتەکە دابوو، بەڵام ئاگای لەوە بوو ئاوەژوو نەبێتەوە. هەرچەند لەو کارەدا چ مەبەستێکی وای نەبوو، بەڵام شێوەی دانیشتنەکەی وای نیشان دەدا کە لە ڕووی ناچارییەوە تووشی نەخۆشخانە بووەو چاوەڕوانییەکی زۆری نییە.

نیکۆلای دەستی بە نووسین کردەوە.

نەخۆشخانە لە پەنایەکی لاچەپی ئۆردووگا دروست کرابوو. هاتوچۆیەکی ئەوتۆی بەسەرەوە نەبوو. لە نەخۆشخانە گوێت لە هیچ دەنگێک نەدەبوو. چرکە چرکی هیچ کاتژمێرێک نەدەهات. زیندانییەکان نەدەبوو کاتژمێریان پێبێ. تەنانەت خرتەی مشکیش لە کونی دیوارەوە نەدەهات. لە نەخۆشخانە گورپەیان ڕادەگرتن و قڕیان لە مشکان خستبوو.

بۆ شۆخۆف دانیشتن لەو ژووره پاک و خاوێنە غەنیمەت بوو. لەو شوێنە بێ قرە و ڕووناکەدا دەیتوانی پێنج دەقەی رەبەق، بەکەیفی دڵی خۆی، بێ ئەوەی تووشی بێگار بێ، لەسەر کورسییەک پاڵ بکەوێ. سەیرێکی دیوارەکانی کرد، هیچ شتێکیان پێوە نەبوو. چاوێکی بە کەوایەکەی خۆیدا خشاند، ژمارەی سەر سینگی پاک ببۆوەو پاسەوانەکان چاویان پێکەوتبا لە چاڵە رەشیان توند دەکرد. دەبوو بردبای ژمارەکەی بۆ بنووسنەوە. دەستە خاڵییەکەی بە دەموچاویدا هێنا. زوور و دڕ بوو. دوا جار دە رۆژ لەمەوبەر بوو کە لە حەمام ریشی تاشیبوو. فەرقی چ بوو، سێ سبەی دەچوونەوە حەمام و دەیتوانی ریشی بتاشێ. راوەستان لە نۆرەی سەرتاشخانەدا، وەخت بەفیرۆدان بوو. لێرە بۆ کێ خۆی تاس و لووس کردبا ؟

شۆخۆف هەروا کە لە تەپلە سپی و خاوێنەکەی نیکۆلای رامابوو، نەخۆشخانەی سەربازیی سەر چەمی «لۆڤات»ی هاتەوە یاد. چەندین جار بە شێوەلاکی بریندارەوە چووبووە ئەوێ و هەموو جارێ–چ گەوجێتییەک– بۆ خۆی گەڕابۆوە بنکەکەی، لە حاڵێکدا دەیتوانی پێنج رۆژی تەواو خۆی بخا.

ئێستا تاقە ئاواتی ئەوەبوو چەند حەوتوو نەخۆش بکەوێ. نەخۆشییەکی مەترسیداری وا نا تووشی نەشتەرگەری بێ، هەر هێندە لە نەخۆشخانە بیخەن. بیری کردەوە لەسەر تەخت لێی رادەکشێ. سێ حەوتوو خرپ بۆی دەخەوێ، ئەو شۆرباوە بێتامەی نەخۆشخانەشیان دابایە قەیدی نەبوو.

پاشان بیری کەوتەوە کە ئێستا لە نەخۆشخانەش نایەڵن زیندانی هەدا بدا. لەگەڵ دوا تاقمی زیندانییان، پزیشکێکیش هاتبووە ئۆردووگا، «ستێپان گریگۆریچ» ، کابرایەکی قۆڕدەماخی هەراش کە نە بۆ خۆی دەحەجمی و نە دەیهێشت نەخۆشیش بحەسێتەوە. هەر نەخۆشێک خۆی بەسەر پێوەگرتبا ، لێرە و لەوێ، لە دەوروبەری نەخۆشخانەدا، بێگاری پێدەکرد. باخچە لێدان، شوورەکێشان، کێشانەوەی خۆڵ بۆ گوڵدان، زستانانیش هەمیشە بەفر بۆماڵین هەبوو. دەیگوت کار باشترین دەرمانی هەموو دەردانە.

ئەوی ئەو کابرایە بە گوێیدا نەدەچوو ئەوە بوو کاری زۆر، وڵاخیش سەکەت دەکا. ئەگەر ئەویش وەک زیندانییەکان تووشی بێگاریی خۆڵ کێشانەوەیان کردبا تا زمانی دەکێشا ، بێگومان زمانی خۆی گرێ دەداو شێوازی لە خۆ دەرهێنراوی کار–دەرمانی لەبیر دەچۆوە.



نیکۆلای هێشتا دەینووسی. بێگومان خەریکی نووسینی شتی خۆی بوو. شیعرێکی پاکنووس دەکرد کە شەوی پێشوو نووسیبووی و بەڵێنی دابوو ئەمڕۆ پێشانی «ستێپان گریگۆریچ»ی پزیشکی نەخۆشخانەی بدا. نیکۆلای بە فیتی ستێپان گریگۆریچ (ئەمەش تەنیا لە ئۆردووگادا دەکرا) خۆی وەکو یاریدەدەری پزیشک پێ قەبڵاندبوون و لە نەخۆشخانە لەبەردەستی ئەودا کاری دەکرد. ستێپان گریگۆریچ فێری ئەوەی کردبوو دەرزی لە دەماری زیندانییانی کلۆڵ رابکا ، کەس بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە نیکۆلای ڤدۆڤشکین هەر فڕی بەسەر ئەو کارەوە نەبێ. نیکۆلای لە کۆلێژی ئەدەب دەیخوێند و دووەم ساڵی خوێندنی بوو کە گیرا. ستێپان گریگۆریچ–ی پزیشکی نەخۆشخانە پێی گوتبوو هەر شتێکی لە دەرەوە نەیتوانیوە بینووسێ، با لێرە بۆ ئەوی بنووسێ.

دەنگێکی کزەڵۆکە کە نیشانەی سەرژمێریی بەیانی بوو لەو دیو پەنجەرە دوو تاکەکەوە دەبیسترا. پەنجەرەکان سەهۆڵیان بەستبوو. شۆخۆف هەناسەیەکی هەڵکێشاو هەستا. هێشتا تای لێ بوو و تەزووی بە لەشیدا دەهاتن. بەڵام وەرگرتنی پشووی بۆ نەچووبووە سەرێ. نیکۆلای یاوگرەکەی لێ وەرگرتەوەو سەیرێکی کرد.

«ئا ، بە لەقە لەق گەیوەتە سی و حەوت و دوو لە دە. ئەگەر سی و هەشت با ، قسەم پێنەدەما. من ناتوانم پشووت بدەمێ. بەڵام دەتوانی لێرە وەمێنی تا دوکتۆر دێ و چاوت لێدەکا ، دیارە وەباڵی مانەوەش لە ملی خۆتە. ئەودەم ئەگەر بۆی دەرکەوت بێحاڵی پشووت دەداتێ، دەنا دەگیرێی. ئەگەر بە من دەکەی وا چاکە بچیەوە سەر کاری خۆت.»

شۆخۆف هیچ دەنگی نەکرد. سەریشی نەلەقاند. تەپلەکەی لەسەر نایەوەو وەدەرکەوت. پیاوی سەرمابردەڵە نابێ چاوەڕوانی شتی خێری لە دەستی یەکێک بێ کە خۆی لەجێگای گەرم و نەرمدایە.

***

هەوای ساردی دەرێ لە دەموچاوی شۆخۆفی دا. تەم پشووی سوار کرد. کۆخە سواری سەری بوو. لەو سەرمای بیست و حەوت پلەی ژێر سفرە دا هاڵاوی لەشی لە سی و حەوت پلەی ژوورووی سفری هەڵبواردبوو. دەبوو لینگی لەبەر بچەقێنێ.

بەرەو خەوگە دایە غاردان. حەوشەکە بە جارێ چۆڵ ببوو. زیندەوارێک بە دەرەوە نەبوو.

بەڵام دڵی خۆیان بەوە خۆش دەکرد، بەشکوو ئەمڕۆ سەرژمێرییان نەکەن. ئەو پاسەوانانەی زیندانییەکانیان دەبردنە شوێنی کار، لە ناو کۆڵیتە گەرمو گوڕەکانیاندا چەک بە دەستەوە، وێژینگیان دەدان. بۆ ئەوانیش راوەستان لە ناو بورجی پاسەوانیدا، ئەویش بەو سەرماو سەخڵەتە، کارێکی ئاسان نەبوو. کاربەدەستەکان لەپازگای گەورەدا سۆبەکانیان پتر نێڵ دەدان. ئێشکگرەکانی ژووری پاسەوانی دوا جغارەکانیان دەکێشان و ئینجا دەهاتنە دەرێ تا خەوگەکان بە سەر بکەنەوە.

زیندانییەکان کە ئێستا کۆنەپەڕۆیان لە هەموو گیانی خۆیان وەرپێچابوو و سەرو پەتکێکیان لەناو قەدی خۆ گرێ دابوو، بە چرو چاوی داپێچراو کە هەر چاویان بە دەرەوە بوون، چەکمە هەڵکێشاو، بە ئارامی و پێڵووی لێکنراوەوە لەسەر تەختەکانیان راکشابوون. چەند دەقەیەکی دیکەی مابوو سەردەستەکان بنەڕێن: «هەمووتان بۆ دەرەوە!»

لەو خەوگەیە کە دەستەی شۆخۆفیشی تێدا دەخەوت، زیندانییەکان خەونووچکە دەیبردنەوە. تەنیا پاڤولۆ-ی یاریدەدەری دەستە، بەئاگابوو. لە کاتێکدا لێوەکانی دەجووڵانەوە، بە قەڵەمێکی دار خەریکی حیسابکردنی شتێک بوو. ئالیۆشای باپتیست، هاوسێکەی شۆخۆف، پاک و خاوێن لە جێگاکەی خۆی، دەفتەرێکی دەخوێندەوە کە نیوەی ئینجیلی لێ نووسیبۆوە.

شۆخۆف بە بێدەنگی چووە لای تەختی پاڤولۆ. پاڤولۆ سەری هەڵبڕی و پرسی: «وا دیارە هەر ماوی ئیڤان دنیسۆڤیچ، نەیانگرتی؟» ئەوە داب و دەستووری ئۆکرانییەکان بوو کە ناوی تەواوی مرۆیان هەڵدەدا. لە ئۆردووگاش ئەو دابەی خۆیان لەدەست نەدابوو. پاڤولۆ جیرەی نانی شۆخۆفی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و وێی دا. تۆزێکیان شەکر بەسەر نانەکەدا کردبوو.

شۆخۆف گەرچی پەلەو دڵەڕاوکەشی بوو، بەڵام بە هەمان لەبزی بە ئەدەبانەوە وەڵامی دایەوە. (یاریدەدەری سەردەستەش کاری بە دەست بوو و تەنانەت لە فەرماندەی ئۆردووگاش زیاتر دەیتوانی بە دەردو مەرگی زیندانی رابگا) شەکرەکەی بە لێوان ماشتەوە، زمانی رە نانەکە خست و خاوێنی کردەوە. پێیەکی لەسەر قەراغی تەختەکە داناو خۆی هەڵێنا تا تەختەکەی رێکوپێک بکا. هەر وا کە سەردەکەوت چاوێکی لە



نانەکە کرد، سەنگ و سووکی کرد تا دڵنیا بێ لێی کەم نەبۆتەوە. شۆخۆف لەو زیندان و ئۆردووگایانەدا هەزاران جار جیرەی نانی وای وەرگرتبوو، ئەگەرچی تاقە جارێکیش بە تەرازوو نەیکێشابوو، لەوەش شەرمنتر بوو لەسەر مافی خۆی بە جواب بێ، بەڵام وەک هەموو زیندانییەک لە مێژ بوو دەیزانی جیرەی نانەکەی تەواو نییە. ئەو جیرەیە هەمیشە کەم بوو. بەڵام مرۆ تەنیا حەزی دەکرد بزانێ چەندی لێ پاشقول دەدەن. بۆیە هەموو جارێ کە جیرەکەیان دەدایە، بە دەست هەڵیدەسەنگاندو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «دەڵێی ئەوڕۆ بەشی من زۆری کەم نییە.» شۆخۆف لە دڵی خۆیدا گوتی: «بیست گرامی کەمە» و نانەکەی لەت کرد؛ لەتێکی لەو گیرفانە ئاخنی کە بە پەڕۆیەکی خاوێن لە کەوایەکەی نابوو. (کارخانە گیرفانی لە کەوای زیندانییان نەدەنا) بیری کردەوە لەو ماوە کورتەدا ئەو لەتە نانە بخوا کە لەگەڵ شێوی بەرچایی نەیخواردبوو، بەڵام خواردنێک بە پەلە پەل قووتی بدەی بە کەڵکی چی دێ؟. نانەکەش خەسار دەبوو و پێشی تێر نەدەبووی. بیری کردەوە دەنێو چەمەدانیی تەختەکەی بنێ، بەڵام هاتەوە یادی کە خزمەتکارەکان چەند جار لەسەر دزی تەمبێ کراون. خەوگە شاری بێ دەروازە بوو. کەوابوو دەبوا جێیەکی باشتر پەیدا بکا. ئیڤان دنیسۆڤیچ چەکمەکانی داکەندن. بەسەرنجەوە پێپێچ و کەچکەکەی لەنێو نان و بە پێخواسی وە سەر تەختەکەی کەوت. دۆشەگەکەی کونێکی تێببوو، قامکی دەبەر نا و زارکەکەی کوشاد کردەوە، نانەکەی دە ناو بڕەی دۆشەگەکە نا. تەپلەکەی لە سەر کرد و دەرزی و دەزوویەکی لێ دەرێنا. (دەرزی و دەزووەکەی بە سەرنجەوە لە تەپلەکەی راکردبوو، چونکە دەیانپشکنین، جارێک دەرزی لە دەستی موفەتیشێک راچوو، دینی لە کن خۆی نەماو وەختابوو بە مستان داگژێتە سەرو گوێلاکی شۆخۆف) بە سێ تەقەڵان زارکی کونەکەی دروویەوە. لەو کاتەدا شەکر لەناو دەمیدا توابۆوە. هەموو قالبی دەلەرزی. سەروبەندی ئەوە بوو نەڕەی موفەتیشێک لەناو دەرگاوە بێ. پەنجەکانی وەک ودودە لە کاردا بوون و بیری ئەوەی پاشان چ بکات بەجارێ نیگەرانی کردبوو.

گوێی لە ورتەی ئالیۆشا بوو کە خەریکی خوێندنەوەی ئینجیل بوو. (ئەو باپتیستانە بۆ پڕۆپاگەندەی خۆیان هەموو هەلێکیان دەقۆزتەوە): «با پیاوکوژ و دز و بوودەڵەتان لەناودا نەبن، هەروەسا ئەوانەش کە لەسەر کاروباری خەڵکی دەبنە سیخوڕ. بەڵام ئەگەر یەکێکیان لەسەر ئەوەی بڕواتان بە مەسیحە ئازار بدرێ، نابێ هەست بە شەرمەزاری

بکا، بەڵکو دەبێ بەو بەشەی خوای خۆی پێی ڕەوا فەرمووە، شوکرانەبژێر بێ.»

ئالیۆشا پیاوێکی زیرەک بوو. کەس نەیدەزانی کتێبی دوعاکەی لە چ کەلێن و قوژبنێکدا دەشارێتەوە کە تا ئێستا هەرچەند خەوگەیان سەنگ و سووژن دابوو، نەیاندۆزیبۆوە.

هەر بەو لەسەرەخۆیی و گورجییەوە خۆی بە میلەی تەختەکەیەوە هەڵواسی و دەستەوانەو جووتە پێپێچێکی تەنک و، پەتکی ناوقەدی و کۆنەپەڕۆیەکی لاسکداری لە بن دۆشەگەکەی دەرهێنان. دۆشەگەکەی بە دەست لێک و لووس کردەوە. (بڕڕەی نێو دۆشەگەکە وەک گلّمتکی لێهاتبوو.) بەتانییەکەی بەسەر دادایەوە، بالیفەکەی لەجێی خۆی داناوەو بەپێخواسی لەتەختەکە هاتە خوارێ و خەریکی لێهاڵاندنی پێپێچەکانی بوو. لە ژێرەوە پێپێچی نوێ و لەسەر ئەوانیشڕا پێپێچە کۆنەکەی لە زەندی بەست.

سەردەستە یەک بەخۆ ئحمێکی کرد و نەڕاندی: «خەو بەسە، دەستەی سەد و چوار، بۆ دەرەوە!»

هەموویان بە خەواڵوویی و بەدەم باوێشکانەوە بەرەو دەرگاکە چوون. سەردەستە نزیکەی نۆزدە ساڵی لە ئۆردووگا رابواردبوو و دەیزانی کەنگێ دەستەکەی وەدەر بنێ. کە دەیگوت «بۆ دەرەوە!» جەنگەی ڕۆیشتن بوو.

زیندانییەکان کرۆکپ و بەهەنگاوی قورس بە دوای یەکدا دەچوونە ڕاڕەوەکەو لە نێو دەرگەی دەرێڕا پێیان دەنایە سەر پلیکانەکان. ئینجا سەردەستەی بیستیش دوا بەدوای تیۆرین گوڕاندی: «هەمووتان بۆ دەرەوە!»

شۆخۆف تازە خەریک بوو لەسەر پێپێچەکانەوە چەکمەی هەڵدەکێشان. ئینجا لەسەر کەواوە پاڵتۆکەی دەبەر کردو پەتکەکەی لە ناوقەدی بەست. (قایشی ناوقەدیان لە زیندانییان دەستاند، لە ئۆردووگای تایبەتدا قەدەغە بوو.)

ئیتر هیچ کارێکی نەمابوو، خۆی گەیاندەوە ئەو ئاخر کەسانەی خەریک بوون وەدەر دەکەوتن. زیندانییەکان کە هەموو گیانی خۆیان داپێچابوو، بەزەحمەت لاقیان هەڵدەهاتەوە. تاک تاک، بێ ئەوەی کەس تالّووکەی بێ، لە دەرگا دەچوونە دەر، لەدەرێ تەنیا کرپەی چەکمان دەهات کە بەفری دەپەستاوتەوە.



وڵات هێشتا تاریک و نووتەک بوو، بەڵام بەری ڕۆژهەڵات سوور هەڵگەڕابوو. تەزوویەکی ساردی دەهات. سەخڵەتترین دەمی ڕۆژ بوو. ئەو کاتە کە مرۆ دەبوو بۆ سەرژمێریی بەیانیان لە نیو ریزدا رابوەستێ، لەو سەرماو تاریکانەداو بە هەناوی بەتاڵەوە. زمانت لە دەمدا سڕ دەبوو. تاقەتت نەبوو لەگەڵ کەس بدوێی.

پاسەوانێک پەیدا بوو. گوتی: «باشە تیۆرین، چەندە دەبێ چاوەنواڕی تۆ بین؟ دیسانەوە وە درەنگی کەوتی.»

کابرا ڕەنگبوو بتوانێ شۆخۆف چاوترسێن بکا، بەڵام دەرەقەتی تیۆرین نەدەهات. تیۆرین لەو سارد و سەرمایەدا تاقەتی نەبوو دەمی لەدەم بنێ. بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە لێی چووە پێشێ. ئەفرادی دەستەش بەدوای ئەودا ڕێچکەیان بەست: تلّپ، تلّپ، کرپ، کرپ.

دیار بوو تیۆرین دووگە بەرازی دابووە کابرا، چونکە دەستەی سەد و چوار هەر لە جێگاکەی جاران ڕاوەستان. کاری کۆمەڵگەی نیشتەجێکردنی ئیشتراکی کەوتبووە ئەستۆی دەستەیەکی کلّۆلّی تر. تەح، ئەمڕۆ لەوێ چ تۆف و زمهەریرێکە، لەو سەرمای بیست و حەوت پلەی خوارەوەی سفر و ئەو کزەبایەی دەهات، بەبێ هیچ ئەنوایەک.

هەرچەند چەورکردنی سمێڵی پیاوانی بەرنامەڕێژی، دووگە بەرازێکی فرەی گەرەک بوو، بەڵام سەردەستە بەشی ئەوەندەی دەست دەڕۆیی نەیەڵێ پەکی ورگی خۆشی بکەوێ. کەس لە دەرێڕا هیچی بۆ نەدەنارد، کەچی قەتیش دووگی لێ نەدەبڕا. هەموو جارێ لە جەنگەی خۆیدا یەکێکی دەستەکە، دووگی زیادەی خۆی دەدایە.

ئەوە تاکە ڕێگای مانەوە بوو.

باشموفەتیش چاوێکی لە تەختەکەی دەستی کرد و گوتی:

«ئەمڕۆ نەخۆشێکت هەیەو بیست وسێ کەسیش لێرەن. وایە تیۆرین؟»

تیۆرین سەری لەقاند و گوتی: «بیست و سێ کەس.»

کێ نەهاتبوو؟ «پانتێلیڤ» لەوێ نەبوو. سندان لەسەری دا! چپە چپێک کەوتە نێویان. پانتێلیڤی قەحپە دایک، دیسان خۆی لە کار دزیبۆوە. عەلەمی لێ نەبوو، ئێستا لە کن

ئەفسەری ئاسایش بوو و داخوا خەریکی ئەوە بوو بۆ یەکێکی تێدەچاند.

لە جەنگەی کاردا لە دوویان دەنارد. جاری وابوو سێ سەعات لە لای خۆیان گلیان دەدایەوەو کەس لەو کەین و بەینە نەدەگەیی. ئەو خۆ دزینەوانەیان بە نەخۆشی بۆ حەساو دەکرد.

زیندانییەکان بە خۆ و پاڵتۆکانیانەوە ئەو ناوەیان ڕەش هەڵگێڕابوو، دەستەکان لە چاوەنۆڕی پشکنیندا، تێکەوەیان داویشت.

شۆخۆف ژمارەکەی وەبیر هاتەوە کە دەبوو بردبای بۆی بنووسنەوەو لە ئاپۆرەکە جوێ بۆوە. یەک دوو کەس لە لای نیگارکێشەکە نۆرەیان گرتبۆوە. شۆخۆف چوو لە پەنایان ڕاوەستا. ئەو ژمارەیە بۆ زیندانی هەر بەڵا بوو. پاسەوانەکان لە دوورەوە دەیانتوانی ژمارەکەی یادداشت بکەن و ئەگەر پاک بباوە و زیندانی لە بیری چووبا بینووسێتەوە، حەپسی تاکەکەسی مسۆگەر بوو.

لە ئۆردووگا سێ زیندانی نیگارکێش بوون. بۆ کاربەدەستانی سەرەوە بە خۆڕایی تابلۆیان دەکێشانەوەو لە کاتی سەرژمێریکردنی بەیانیاندا ژمارەی زیندانییەکانیان دەنووسینەوە. ئەمڕۆ نۆرەی پیرەمێردەکە بوو کە ریشی ماشو برنجی و تەنک بوو. کە ژمارەی کڵاوی دەنووسی لە قەشەیەک دەچوو خەریکی چەورکردنی هەنیەی مرۆڤ بێ. بە فڵچە ژمارەیەکی دەنووسی، ئینجا ژمارەیەکی تر و پاشان هووی لە سەری قامکەکانی دەکرد. جووتێک دەستەوانەی تەنک و تەنگی هەبوو، دەستی تێدا کۆڵ ببوون.

ژمارەی «ئێس-٨٥٤»ی لەسەر کەوایەکەی شۆخۆف نووسی. شۆخۆف هەروا پەتکەکەی ناوقەدی بەدەستەوە زەحمەتی بەستنەوەی وەبەر خۆی نەدەدا، لەبەر ئەوەی زۆری نەمابوو بگاتە موفەتیشەکان- گەڕایەوە لای دەستەکەیان. لەپڕێکا چاوی بە سیزار، یەکێ لە ئەفرادی دەستەکەی کەوت کە جغارەی دەکێشا. سیزار سەبیلەی دەکێشا، بەڵام ئێستا جغارەیەکی بە لالێویەوە بوو، ئەگەر بەخت یار بوایە شۆخۆف مژێکی وەگیر دەکەوت. بەڵام هیچی نەگوت. لەپەنای ڕاوەستا، ئاوڕی وێدا و سێرەی دایە.

وای دەنواند هۆشی لەو نییە، بەڵام لە بنەڕەتدا سێرەی دابۆیەو دەیدی بە هەر مژێک کە لە جغارەکەی دەدا (سیزار لەگژ فکران ڕاچووبوو و جار ناجار مژێکی لێدەدا) ئاڵقەی سووری



سووتووەکەی نزمتر دەبێ و ئاگر لە قوونچکی جغارەکە نیزێک و نیزێکتر دەبێتەوە.

لەو ئان و ساتەدا تەرح و دیداری فتیۆکۆفی شڕەخۆریش پەیدا بوو، لە پێش سیزار چەقی و بە حەسرەتەوە چاوی لە دەمولەوسی بڕی.

شۆخۆف پەلکە توتنێکیشی پێنەمابوو، تا شەوێش ئومێدی نەبوو دەستی بکەوێ. ئازای لەشی دەیچریکاند و ئاواتەخواز بوو ئاڵقەی سووتووەکە نەگاتە قوونچکی جغارەکە. لەو جەنگەیەدا رزگار بوونی خۆی سەربەسەر بەو قوونچکە جغارەیە دەدا، بەڵام نەشیدەتوانی وەک فتیۆکۆف ملی بەلارەوە بنێ و چاو لە زاری خەڵکی ببڕێ.

***

سیزار چێشتی مجێوری هەموو ڕەگەزان بوو. پیاو نەیدەزانی یۆنانییە، جوولەکەیە یان قەرەجە. تەمەنی زۆر نەبوو. پیشەی فیلمسازی بوو و بەر لەوەی یەکەم فیلمی تەواو بکا گیرابوو. سمێڵێکی ڕەش و ئەستووری پێوە بوو. هەتا تەرحی لە وێنەی سەر دۆسیەکەی بکا، سمێڵیان پێنەتاشیبوو. فتیۆکۆف کە چیدی خۆی پێ ڕانەدەگیرا لیکی دەمی قووت دایەوەو گوتی: «سیزار مارکۆڤیچ، ماڵتە، مژێکم وێ بدە!» دەموچاوی وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو.

سیزار برۆی هەڵکێشان- برۆی بۆ چاوەکانی ببوونە کەپر-و سەیرێکی فتیۆکۆفی کرد. لە داخی لاکێشان سەبیلەی دەکێشا. لەبەر ئەوەش نەبوو دڵی توتنی نەیە، بەڵام حەزی نەدەکرد لە کاتی جغارەکێشاندا هیچ کەس هەودای خەیاڵی لێ بپسێنێ. دووکەڵی جغارەکە بیری دەورووژاند و کەڵکەڵەی سەیری بەمێشکیدا دەهاتن. بەو حاڵەشەوە تەواو جغارەی دانەدەگیرساند بە هەمووان چاویان تێدەبڕی و بەزمانی بێزمانی، سواڵی قوونچکی جغارەکەیان لێدەکرد.

سیزار بە لای شۆخۆفدا وەرسووڕا و گوتی: «ها بۆ خۆت، ئیڤان دنیسۆڤیچ!» بە قامکی شادە قوونچکە جغارەکەی لە مۆدنە گچکە کارەباییەکەی دەرێنا. شۆخۆف ڕاچەنی (وەک بڵێی ئاگای لە هیچ نەبێ و سیزار هەروا لە خۆوە جغارەکەی دابێتێ) و بەسوپاسەوە، بێ سێ و دوو لێی وەرگرت و دەستەکەی تری وەبەر گرت. سیزار مۆدنەکەی وێ نەدابوو، بەڵام شۆخۆف ئەو کارقایمییەی سیزاری لە دڵی گران نەهات. (دەمی هەندێکان خاوێنە و

دەمی هەندێکانیش بۆن هەڕناهووت و بۆدرنی لێوە دێ) ئەنگوستە قەڵشیوەکانی بە ئاوری قوونچکە جغارەکە نەدەزوورانەوە. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو لە قەوچی فتیۆکۆڤی شرەخۆر درابوو. دەیتوانی تا تینی جغارەی دەگاتە لێوان هەر مژی لێبدا.

م م م م... ئەو دووکەڵە دەتگوت دە ئازای ئەندامە تامەزرۆ و برسییەکانی مردووە. سەری لە گێژەوە هات و ئەژنۆی سست بوون.

لەو جەنگە خۆشەدا بوو بە هەرا:

«فانیلەکانمان لەبەر دەردێنن...!»

ژیواری ئۆردووگا هەر ئەمە بوو. شۆخۆف بەو شتانە تەقەشی لەسەری نەدەهات. تا دەهاتی پشوویەکی رەحەت بدەی، بەربینگیان پێدەگرتی.

بەڵام فانیلەکانمان بۆ؟ فەرماندە خۆی فەرمانی ئەو پشکنینەی دابوو... نا ، بێ و نەبێ شتێک لە ئارادا یە...

دوو دەستەیان مابوو نۆرەیان بێ. ئەفرادی دەستەی سەد و چوار هەموو چاویان لە ستوان ڤۆلکۆڤی، ئەفسەری ئاسایش، بریبوو. لە فەرماندەییەوە هاتبوو و بە دەنگی بەرز فەرمانێکی بە پاسەوانەکان دەدا. پاسەوانە خوێڕیلەکان ئێستا لە لای ئەو وەک سەگی هاریان لێهاتبوو. سەرپاسەوانەکە نەڕاندی:

«فانیلەکەت داکەنە!»

***

دەیانگوت تەنانەت فەرماندەش لەو ڤۆلکۆڤییە دەترسێ، چ جای پاسەوانەکان. ڤۆلکۆڤی ناوێکی پڕ بە پێستی خۆی بوو[٦]. بەو چاوانەیەوە کە دەتگوت چاوی گورگن لێت رادەما. رەشتاڵەیەکی مرومۆچ بوو. خۆی بە گشت شوێنێکدا دەکرد. لە پڕێکا لە پشت خانوویەک قوت دەبۆوە و بەسەر زیندانیدا دەیشیراند: «بۆ لێرەی؟» مرۆ لە هیچ کوێ لە چنگی دەرنەدەچوو. تا ماوەیەک ڤۆلکۆڤی بە قەمچییەکی لە چەرم هۆنراو کە بەقەد دەستی درێژ بوو لە ناو ئۆردووگادا دەخولایەوە. دەیانگوت بەو قەمچییە لە پاسەوانان دەدا. لە کاتی سەرژمێریی شەواندا لە پشت سەری زیندانییەک قوت دەبۆوە، قەمچییەکی



لە پشت ملی دەسرەواند و دەیگوڕاند: «برۆ ناو ریزەکە بۆگەن!» کەس نەدەوێرا لا بکاتەوە. ئەو زیندانییەی قەمچیی وێدەکەوت دەستی بە لاملیەوە دەگرت و خوێنەکەی دەسڕیەوەو لە ترسی زیندانی تاکەکەسی ورتەی نەدەکرد.

بەڵام ئێستا ، لەبەر کۆمەڵە هۆکارێک، ڤۆلکۆڤی ئیتر قەمچیی هەڵنەدەگرت.

***

لە کاتی سەرماو سۆڵدا، پشکنینی بەیانییان زۆر درێژ نەدەکردەوە، بەڵام شەوانە موویان لە ماست دەردەکێشا.

زیندانییەکان پەتکی ناوقەد و قۆپچەی پاڵتۆکانیان کردبوونەوە. بە پێنج ریز دەچوونە پێش و پێنج پاسەوان چاوەڕوانیان بوون. دەستیان لە پاڵتۆ و کەوای زیندانییەکان دەگێڕا. گیرفانیان دەپشکنین (تاقە گیرفانی پانتۆڵ). دەستەوانەکانیان ئاوەژوو دەکردنەوەو ئەگەر شتێکیان تێدا دۆزیبانەوە یەکسەر دەریان نەدێنا ، بەڵکو دەیانپرسی: «چت لێرە ناوە؟» ئینجا تا بۆیان کرابا پشکنینەکەیان دەگنخاند.

بەو بەیانییە چ شتێکیان لەناو جلوبەرگی زیندانیدا دەدۆزیەوە؟ لە چەقۆ دەگەڕان؟ خۆ کەس چەقۆ ناباتە دەرێ، لە دەرێڕا دەیانهێنایە ئۆردووگا. بەیانیان تەنیا دەیانویست بزانن کێ بۆ راکردن خواردنی زیادەی پێیە. ماوەیەک بوو دڵیان لەو نانە دەترسا. هەر زیندانییەی دووسەد گرام جیرەی فراڤینی خۆی هەبوو. ئەوکاتە فەرمانێک دەرچوو کە هەر دەستەو سندووقێکی دار بۆ ئەفرادی خۆی دروست بکاو نانی هەموانی تێ باوێن. کەس نەیدەزانی قازانجی ئەو کارە لە کوێدایە. تەنیا لەوانەبوو بیانەوێ ژیانی زیندانییەکان لەوەی کە هەبوو تاڵتر بکەن و پتریان ئازار بدەن. نانی جیرەی خۆت بە قەپاڵتەیەک نیشانە دەکرد و دەتهاویشتە ناو سندووقەکەوە. بەڵام هەموو نانەکان وەک یەک وابوون. نانێکی سەروگوێ خوراو.

ئینجا هەمیشە دڵەڕاوکەی ئەوەت بوو نەکا نانەکەی خۆت دەست نەکەوێتەوە، جاری وابوو کار دەگەیشتە شەڕ و پێکهەڵپرژان. رۆژێکیان سێ زیندانی بە لۆرییەک لە کارگای بیناسازییەوە رایانکرد و سندووقێکیان دەگەڵ خۆیان برد. ئینجا بە فەرمانی سەرەوە سەردەستەکان سندووقەکانیان بردنەوە ژووری پاسەوانی و دیسان مەسەلەی نانەکە وەک خۆی لێهاتەوە.

بەیانییان لەبەر شتێکی تریش لەشیان دەپشکنین، نەکا یەکێک لە ژێر بەرگی ئۆردووگاوە جلی خۆی لەبەرکردبێ. لەمێژبوو ئەو جلانەیان لێ ئەستاندبوون و پێیان گوتبوون پاشی ئازاد بوون وێیان دەدرێنەوە. بەڵام تا ئێستا هیچکەس پێی لەو ئۆردووگایە نەبردووە دەرێ. مەبەستێکی دیکەشیان دۆزینەوەی نامە بوو-نامەیەکی وا کە بە نهێنی لە ئۆردووگارا نێردرابا دەرێ و گەیشتبا دەست خەڵکی ئازاد-و ئەو جارانەی مەبەستیان نامە بوایە پشکنینەکە تا نیوەڕۆیەی دەخایاند.

ڤۆڵکۆڤی بەسەر موفەتیشەکاندا گوڕاندی کە بە وردی بیانگەڕێن، ئەوانیش دەستەوانەیان لە دەست دەرهێنان. فەرمانیان بە زیندانییەکان دا کەواکانیان دابکەنن (هێشتا برووکە گەرمایەکی خەوگە لە کەواکانیاندا مابوو) و قۆپچەی شاڵوارەکانیان بکەنەوە. بۆ دۆزینەوەی جلی یاساغ، هەموو لەشی زیندانییەکانیان دەپشکنی. زیندانی بۆی هەبوو تەنیا کراسێک و فانیلەیەک لەبەر بکا و هەر جلێکی تری لەبەردابا لەبەریان دادەڕنی. ئەمە فەرمانی ڤۆڵکۆڤی بوو و زیندانییەکان دەماودەم تا گەیشتە دواڕیز بۆ یەکتریان گێڕایەوە. خۆش بەحاڵی ئەو دەستانەی زووتر پشکنرابوون. هێندێکیان لە دەروازەی ئۆردووگاش تێپەڕیبوون. ئەوی مابوونەوە دەبوو تا ناوقەد خۆیان رووت بکەنەوە. ئەوی جلێکی زیادەی پێبا دەبوو هەر لەوێ، بەو سەرمایە دەری بێنێ!

موفەتیشەکان دەستیان پێکرد، بەڵام دواتر کارەکەیان تەگەرەی تێکەوت. دەروازەکان چۆڵ ببوون و ئێشکگرەکان دەیاننەڕاند: «بجووڵێن، خێرا دەی!» کە نۆرە گەیشتە دەستەی سەد و چوار ڤۆڵکۆڤی فەرمانەکەی گۆڕی. بڕیار درا هەر زیندانییەک جلی زیادەی پێیە، راپۆرت بدا و شەوێ بە روونکردنەوەیەکی نووسراو کە چۆن و بۆچی لە ئێشکگرەکانی شاردۆتەوە، بیداتە عەمبار.

شۆخۆف هەموو جلەکانی یاسایی بوون و لە پشکنین نەدەترسا. هەتا شل وکوت دەبن با بیپشکنن. کراسێکیان لە سیزار ئەستاند و گەمیەوانیش جلیتقە یان شتێکی لەو بابەتەی لە ژێر کەوایەوە دەبەر کردبوو. گەمیەوان کردیە هەڵلا، - دەتگوت هەر لەسەر پاپۆڕە- تەنیا سێ مانگ بوو گیرابوو.

ئێوە مافی ئەوەتان نییە بەو سەرمایە خەڵکی رووت بکەنەوە! ئەم کارە پێچەوانەی بەندی نۆی یاسای سزادانە.» ئەوان دەیانزانی چ دەکەن و ئاگاداری بەندی نۆش بوون بەڵام ئەو تازە هاتووە ئاگاداری زۆر شت نەبوو.



گەمیەوان لەسەری رۆیی: «ئێوە خەڵکی سۆڤیەت نین، کۆمۆنیست نین!» ڤۆڵکۆڤی هیچ خۆی تێک نەدا، بەڵام لە رکان شین و مۆر ببۆوە. نەڕاندی: «دە رۆژ حەپسی تاکەکەسی!»

کەمێ دەنگی نزم کردەوەو سەرپاسەوان گوتی: «لەو شەوڕا دەست پێدەکا.»

بەیانیان کەسیان نەدەگرت. چونکە ئەوەیان لەدەست دانی رۆژە کارێکی زیندانی بوو. لێی دەگەڕان رۆژێکی تەواو زمان بکێشێ، ئینجا شەوێ دایاندەکردە ژووری.

خانووی زیندان لەوێ نزیک بوو. لە دەستەچەپی حەوشەی سەرژمێری بوو. دوو ریز خانووی خشتە بوو. ریزی دووەمیان ئەوساڵ پاییزێ دانابوو، ریزەکەی دی بەرتەنگ بوو. زیندان هەژدە بەندی بە سلوولی تاکەکەسییەوە هەبوون و تەنیا خانووی بە خشت دانراوی ئۆردووگا بوو. خانووەکانی تر گشتی لە دار چێ کرابوون.

***

زیندانییەکان لەبەر دەروازە پاڵتۆکانیان دەبەر کردنەوە و ئێشکگرەکان لەودیو دەروازە چاوەڕێیان بوون.

«بجووڵێن، خێرا دەی!»

لە دوایەڕا موفەتیشێک پاڵی بە زیندانییەکانەوە دەنا:

«خێراکەن! خێرا دەی!»

حەوشەی سەرژمێری دەروازەیەکی هەبوو. دەروازەیەکی تریشی هەبوو کە نەردەیان بەهەر دوو لایدا کێشابوو. پاسەوانێکیان گوڕاندی: «راوەستن! بۆ وەک گاڕان وەرێ کەوتوون؟ بەپێنج ریز!»

هەوا بەرە بەرە رووناک دەبوو. لەو بەری پازگا ئاوری ئێشکگرەکان بڵێسەی دەدا. هەمیشە پێش سەرژمێری ئاوریان دەکردەوە تا خۆی لەبەر گەرم بکەنەوەو لەبەر رووناکییەکەی، زیندانییەکان بژمێرن. یەک لە دەرگەوانەکان بە دەنگێکی گڕ و بەرز دەیژماردن: «یەک، دوو، سێ!»

زیندانییەکان بە پێنج ریز لە دەروازەکە ڕەت دەبوون. هەموو ریزەکان لەپێشەوە و لە دوایەڕا دەبینران. پێنج سەر، پێنج پشت، دە لاق.

لەودیوی دەروازە پاسەوانێکی دی لە پەنا نەردەکان راوەستابوو. کرِ و بێدەنگ چاوی لە ریزەکان بڕیبوو تا لە ژماردندا بە هەڵە نەچن.

ئەفسەری پاسەوانیش بۆ ژماردنی دووبارە لە نووسینگەکەی هاتبووە دەرێ و سێرەی دابووە تێپەڕینی زیندانییەکان. هەموو بەیانیان کە زیندانییەکان لە ئۆردووگا وەدەر دەکەوتن، ئەو بەرنامەیە دووپات دەبۆوە.

بۆ پاسەوان سەری هەر زیندانییەک زێرێکی دێنا. ئەگەر لەو دیوی تێلبەند یەکێک کەم بوایە دەبوو دەمودەست بۆخۆی شوێنەکەی پڕ بکاتەوە.

زیندانییەکان بوونەوە دەستە دەستە.

ئەوجار گرووبانی پاسەوان دەستی بە ژماردنیان کرد: «یەک، دوو، سێ!» دیسان ریزە پێنج کەسییەکان بە جیا بە بەردەمیدا تێپەڕین. جێگری گرووبانیش لەوسەرەوە دەیژماردن.

ئینجا ستوانێکی دیکە هەبوو، ئەوی پاسەوانەکان ژماردبوویانن، سەرلەنوێ دەیژماردنەوە. هەڵە چاوپۆشی لێنەدەکرا. کەسێکیشیان لە دەستی زیاد هاتبا سەریان دەچووە قوڕ.

دەرەوە لە پاسەوانان جمەی دەهات. ئەو قەتارەی دەچوونە وێستگەی کارەبا هەڵیانئاواردبوون. چەکەکانیان سوار بوون. هەندێ پاسەوانی دیکەش سەگیان پێبوون. سەگێک کەڵبەی دەرخستبوون، دەتگوت بە زیندانییەکان پێدەکەنێ. گشت پاسەوانەکان کورتەکی کەوڵیان لەبەردابوو. تەنیا شەش کەسیان پاڵتۆی شاقەل درێژی کەوڵەبەرخیان هەبوو کە تا سەر گوێزینگیان دەهات و کاتێ دەچوونە سەر بورجی دیدەوانی بە نۆرە دە بەریان دەکردن.

جارێکی دیکەش بە پێنج ریز ژماردیاننەوە. گەمیەوان گوتی: «بەیانان هەوا لە هەموو وەختان ساردترە. چونکە زەوی شەوانە گەرمای تێدا نامێنێ و ئەودەمەی خۆر هەڵدێ سەرما دێتەوە نزمترین پلەی خۆی.»



گەمیەوان حەزی لەوە بوو بۆ هەر شتێک باس و لێکدانەوەیەکی هەبێ. بە چاولێکردنی مانگ، رێکەوتی هەموو رۆژەکانی ساڵی دەزانی، چ ئەو شەوانەی مانگ یەکشەوە با و چ ئەو شەوانەی مانگ پڕ بوایە.

گەمیەوان بە ئاشکرا شڵەژابوو، گووپی پێکدا تەپیبوون، بەڵام وە سەر خۆی نەدەهێنا.

***

لە دەرەوەی ئۆردووگادا سەرما حەشری دەکرد. دەموچاوی شۆخۆفیش، کە بە هەموو چەشنە هەوایەک راهاتبوو، خۆی لەبەر ئەو باسریشکەی بەرەو روویان دەهات، رانەدەگرت. دەیزانی تا وێستگەی کارەبا با هەروا لە دەموچاویان دەدا، بۆیە پەڕۆکەکەی لە دەموچاوی بەست. ئەویش وەک هەموو زیندانییەکان پەڕۆکێکی لاسکداری بۆ وەختی وا پێبوو. ئەو رووبەندە شتی چاک بوو. دەموچاوی تا بەر چاوان پێ داپۆشی و لاسکەکانی بە پشت گوێیدا بردن و لە پاشە سەری لێکی گرێ دان. ئینجا پشت ئەستۆی بە گوێچکەی تەپلەکەی داپۆشی. ئێخەی پاڵتۆکەی هەڵدایەوەو دەمامکی تەپلەکەی تا سەر تەوێڵی داکێشا، بە جۆرێکی وا کە تەنیا چاوەکانی بە دەرەوە مابوون. پەتکەکەی لەناو قەدی توند کرد. ئیتر لە هیچی کەم نەبوو. حەیف دەستکێشەکانی تەنک بوون و پەنجەی لەگۆ دەچوون. دەستی لێک خشاندن و چەند جار لەپی دەستی پێکدا کێشان. لەوێڕا تا وێستگە دەبوو دەستان لە پشت قوونی بگرێ و رێ بکا.

سەرپاسەوان بە دەنگێکی بەرز «وەعز»ی رۆژانەی دادا. وشەگەلێک کە زیندانییەکان دڵیان پێ لە ژێلڵا دەهات.

زیندانییان سەرنج بدەن! دەبێ دامو دەستووری رۆیشتن بێ ئەملاولا لەبەر چاو بگیرێن. ریزەکە تێک مەدەن. بە هەنگاوی لەسەرەخۆ و مەحکەم برۆن. ورتەتان نەیە. چاوتان لە بەرپێی خۆتان بێ و دەستانیش لەپشتەوە بگرن. لادان لە رێگا بە چەپ و راستدا، بە راکردن دەژمێردرێ و ئێشکگرەکان بەبێ تێراخوڕین تەقە لە کەسی خەتاکار دەکەن. ریزی یەکەم، رێ، بکە!»

دوو پاسەوان وە پێشیان کەوتبوون. ریزەکە لە جێی خۆی هەڵقەنا و بۆ پێشەوە شەپۆلی دا. بەلای چەپ و راستدا پاسەوانەکان بە مەودای بیست هەنگاو لە ریزەکەوە، لە

کاتێکدا چەکەکانیان لە سەر پێ بوون، وێڕای زیندانییەکان ڕێگایان دەپێوا.

ئاخر جار کە بەفر باریبوو حەفتەیەک لەمەو بەر بوو، ئێستا ڕێگاکە بە هاتوچۆ پەسترابۆوە. بە دەوری ئۆرودووگادا لێهاڵانەوە، کزەبا لە تەنیشتڕا لە لاچاوی دەدان. دەستیان دە پشت قوون نابوون. سەریان داخستبوو، قەتارەکە دەتگوت تەرمێک دەباتە گۆڕستان . تەنیا قاچی دوو سێ زیندانی و پارچەیەکت ڕێگای تەخت لەبەردەم خۆتدا دەدی کە هەنگاوەکانتی دەکەوتنە سەر. جار بە جار یەک لە پاسەوانەکان دەینەڕاند: «ک-٤٨، دەستەکانت بەرە دواوە!» یان «ب-٥٠٢ لەگەڵ کەسی پێشەوەی خۆت ڕاست بە!» دوایە ئەوانیش تاقەتیان بەسەرچوو. با لە دەموچاوی دەدان و چاویان هەڵنەدەهات. پاسەوانەکان بۆیان نەبوو دەموچاویان بە پەڕۆک داپۆشن و ئەو ڕێگاپێوانە بۆ ئەوانیش گەمە نەبوو.

کە تاووبان خۆش با، هەرچەندی پاسەوانەکان گوڕاندبایان، زیندانییەکان بێدەنگ نەدەبوون. بەڵام ئەمڕۆ هەموو سەریان بردبوونەوە نێو ئێخان. هەرکەس خۆی لە پشت کەسی پێشەوەی خۆی دەگرت و لەگێژ فکر و خەیالان ڕۆ دەچوو. زیندانی خۆ فکر و خەیاڵەکانیشی ئازاد نین. بیرێکی چلومل هەمیشە بەربینگی پێدەگرێ. بڵێی ئەو نانەی لەناو دۆشەگەکەدا شاردوومەتەوە نەیدۆزنەوە؟ ئاخۆ ئەوشۆ نێوم لە لیستەی ناوی نەخۆشان دەنووسرێ؟ دەبێ گەمیەوان بیەنە حەپسی تاکەکەسی؟سیزار ئەو فانیلە مەرەزەی لەکوێ بوو؟ دەبێ لە عەمبار سمێڵی کێی چەور کردبێ؟ دەنا فانیلەی وای لە کوێ دەست دەکەوێ؟

شۆخۆف چونکە ئەمڕۆ بەبێ نان تێشتی کردبوو و شێوەکەشی سارد ببۆوە، هەر قووڕەی زگی دەهات. بۆ ئەوەی کەڵکەڵەی خواردن لە سەری خۆی بباتە دەرێ، ئۆردووگای لەبیر خۆی بردەوەو فکری لە نامەیەک کردەوە کە قەرار وابوو ئەمڕۆ سبەی بۆ بنەماڵەکەی بنووسێ.

قەتاری زیندانییەکان بە پێش کارگەی دارتاشیدا، کە خۆیان دایاننابوو، تێپەڕی. بە بەر دەم گوندی کرێکارانی ئازادیشدا ڕەت بوو (کە ئەویش هەر بە دەستی خۆیان چاک کرابوو) و لە یانەش تێپەڕین، (خانووی یانەش دەستکردی زیندانییەکان بوو، لە یەکەم بەردی بناغەوە تا وردەکاری و سپی کردنەوەی دیوارەکان، بەڵام تەنیا کرێکارانی ئازاد



لەوێ چاویان لە فیلم دەکرد). ڕیزەکە ڕوو لە با، ڕێگای پێدەشتی گرتە بەر. بازنەی سووری خۆر ئاسۆگی هەمبەریانی ڕووناک کردبۆوە. تاقەدارێکیش لە دەوروبەریان نەدەبینرا. تا چاو هەتەری دەکرد پزووی سپی و یەکدەستی بەفر بوو.

***

ساڵی تازە، ١٩٥١، دەستی پێدەکرد و شۆخۆف ئەوساڵ دەیتوانی دوو نامە بۆ کەس و کاری بنووسێ. مانگی ژووئیە دوا نامەی نووسیبوو و لە مانگی ئۆکتۆبەردا وەڵامی بۆ هاتبۆوە. لە «ئوست- ئیژما» دابودەستوورەکە جودا بوو. هەر مانگەو دەتتوانی نامەیەک بنووسی، بەڵام لە نامەدا چت هەبوو بینووسی؟ شۆخۆف لە «ئوست-ئیژما»ش لەو یەک دوو نامەیەی لێرە لە ساڵدا دەیتوانی بینووسێ، زیاتر بۆ ژنەکەی نەدەنووسی.

شۆخۆف ڕۆژی بیست و سێی ژووئەنی ساڵی ١٩٤١ لە ماڵێ وەدەرکەوتبوو. بەرەبەیانی ڕۆژێکی یەکشەممە بوو، خەڵک پۆل پۆل لە کڵێسەی «پۆلۆمنیا» ڕا دەگەڕانەوە و باسی هەڵاییسانی شەڕیان دەکرد. لە پۆستخانە هەواڵی شەڕی بیستبوو. لە «تێمنێ نۆڤۆ»، ئەو گوندەی ئەوی لێ دەژیا، تا پێش جەنگ کەس رادیۆی نەبوو، بەڵام ئێستا بۆیان نووسیبوو کە لە ماڵی هەموو گوندییەکاندا رادیۆیان دامەزراندوون کە هەمیشە باس و هەرایانە. نامە نووسینی ئێستا وەک ئەوە وابوو بەردێک باوێژیە نێو بیرێکی قووڵ. بەردەکەت لە بیرەکە داویشت، بەڵام هیچ سەدایەکی نەبوو، باسی ئەوە کە لە تەک کام دەستەدای و سەردەستەکەت چتۆ کەسێکە، بە چ کەڵکی ئەوان دەهات؟ ئێستا پیاو قسەی لەگەڵ ئەو کیلگاسە لاتڤییە پتر بوو، نەک لەگەڵ بنەماڵەکەی.

ئەوانیش ساڵێ لە وەڵامی ئەو دوو نامەیە زیاتر پێیان نەدەنووسرایەوە و پیاو بەو شێوەیە ئاگاداری حاڵ و باڵیان نەدەبوو. بەرێوەبەرێکی نوێ هاتبووە کۆڵخۆزەکەیان، بەڵام خۆ ئەوەش هەواڵێکی نوێ نەبوو! کۆڵخۆزەکەیان لەگەڵ زەویی کۆڵخۆزەکانی دەوروبەریان تێکەڵ کردبۆوە. هەموو ساڵێ ئەو بەزمە بوو، هەموو شتێکیش دەهاتەوە سەر حوللەمەرەسیەکەی جاران. یانژی دەیاننووسی گوندییەک بەشەکاری خۆی ڕانەپەڕاندووە و زەوی و زارە تایبەتییەکەیان لێ کردۆتەوە هێکتار و نیوێک، بابایەکی دی هەموو زەوییەکەیان لێ ئەستاندۆتەوە.

ئەو شتەی شۆخۆف سەرەدەری لێ دەرنەدەکرد ئەوە بوو ژنەکەی لە نامەکانیدا یەک وشەشی لەبارەی ئەو کەسانەوە نەدەنووسی کە تازە هاتبنە کۆڵخۆزەکەیان. لە سەردەمی جەنگەوە تا ئێستا یەک کەسیشیان لێ زیاد نەببوو. هەموو هەرزەکارەکانیان بۆ کاری کارخانە و کانگای زوخاڵ رەپێچەک دابوون. نیوەی پیاوان لەشەڕ نەگەڕابوونەوەو ئەوانەی هاتبوونەوەش چ قازانجێکیان بۆ کۆڵخۆز نەبوو. لە کۆڵخۆز دەژیان و لە شوێنی تر کاریان دەکرد. لە پیاوانی گوندەکەیان تەنیا «زاخار ڤاسیلیچ»ی سەرۆکی کۆڵخۆز و «تیخۆن»ی دارتاش مابوونەوە کە تەمەنی تیخۆن هەشتاو چوار ساڵ بوو. بە پیری ژنی هێنابوو و بەو تەمەنەوە ببووە بابی چوار منداڵان. ئەو ژنانەی هەر لە سەرەتاوە واتە لە ساڵی ١٩٣٠یەوە لەوێ کاریان دەکرد، کاروباری کۆڵخۆزیان هەڵدەسووڕاند.

شۆخۆف لە کاروباری ئەو کەسانە نەدەگەیی کە لە کۆڵخۆز دەژیان و لە شوێنی تر کاریان دەکرد. شۆخۆف هەم لە کێڵگەی تایبەتی و هەم لە کێڵگەی ئیشتراکیدا کاری کردبوو، بەڵام ئەمەی بۆ نەدەچۆوە سەریەک کە چۆن دەبێ جووتیارێک لە گوندەکەی خۆی کار نەکا. ئاخۆ جۆرە کارێکی وەرزییان هەبوو؟ وردەواڵەیان دەگێڕا؟ ئەدی کێ دروێنەی گیای دەکرد؟

ژنەکەی لە نامەدا بۆی نووسیبوو لەمێژە کاری وەرزی دەست ناکەوێ. کەس ئێستا کاری دارتاشی ناکا -خەڵکی گوندەکەیان بەو پیشەیە بە ناوبانگ بوون- ئێستا کەس سەبەتان ناچنێ، چونکە لە رمێن کەوتوون. خەڵکی ئاوایی فێری پیشەیەکی نوێ ببوون، ئەویش نەخش کردنی مافوور بوو کە کارێکی ئاسان و بێ گرفت بوو. پاش تەواوبوونی شەڕ گوندییەک نەخشەیەکی مافووری لەگەڵ خۆی هێنابۆوە و ئیتر بۆخۆی پێ ئەنگڕابوو. هەموو رۆژێ تاقمێکی تر دەستیان بەو کارە دەکرد و خەڵکی ئاوایی چاکی لێ کارامە ببوون. دەستیان بەتاڵ بوو و ساڵێ تەنیا مانگێک، لە وەرزی خەلە و خەرمان و داخستنی تفاق بۆ کۆڵخۆز سەرقاڵ بوون. مۆڵەتی ئەوەیان لە کۆڵخۆز وەردەگرت کە یازدە مانگەکەی تری ساڵ، بەبێ دانی پیتاک، بۆ خۆیان کار بکەن. سەرانسەری وڵاتیان دەپێوا و بۆ ئەوەی وەختیان بۆ بگەڕێتەوە سواری فڕۆکەش دەبوون. بە فرۆشتنی ئەو مافوورانە هەزاران رووبڵیان دەست دەکەوت. بۆ نەخش کردنی هەر مافوورێک پەنجا رووبڵیان وەردەگرت و گوایە هەر مافوورەو سەعاتێکی پێوە دەبوون. ژنەکەی ئاواتی ئەوەبوو رۆژێک لە رۆژان ئەو بگەڕێتەوەو خەریکی نەخش کردنی مافووران بێ. ئەوەدەم لەو



هەژارییە رزگاریان دەبوو. منداڵەکانیان دەناردنە فێرگەی پیشەیی و لە باتی ئەو کۆڵێتە کۆن و چەپرەکەی تێیدا دەژیان، خانوویەکی نوێیان دەکڕی. هەموو نەخش کەرەکان ببوونە خودان خانووبەرەی نوێ. لەو ماوەیەدا نرخی خانوو دوو بەرامبەر بەرز ببۆوە، خانوویەک لەسەر رێگای قەتار پێنج هەزار رووبڵی هەڵدەگرت.

شۆخۆف لەوەڵامدا بۆی نووسیبوو من چووزانم مافووران نەخش بکەم؟ لە هەموو تەمەنی خۆیدا تاکە جارێکیش فلچەی بە دەستەوە نەگرتبوو. باشە ئەو مافوورانە دەبێ چ توحفەیەک بن؟ چ نەخشێکیان لەسەر دەکەن؟ ژنەکەی وەڵامی دابۆوە دەست و پێ سپیلکەش ئەو ئیشەیان لەدەست دێ. هەر هێندەی دەوێ کلێشەکە لەسەر مافوور دابنێی و کونەکانی بە رەنگ پڕ بکەیەوە. سێ جۆر نەخش هەبوون. نەخشێک کە پێیان دەگوت «ترویکا» وێنەی فایتوونێک بوو، هەوسارێکی لەسەر بوو و سێ هەسپ بە لغاوی جوانەوە رایاندەکێشا. نەخشێکی دی وێنەی کەڵەکێوییەک و نەخشەکەی تریش لە شکڵی فەرشی ئێرانی بوو. هەر ئەوەندە نەخشانە بوون، بەڵام خەڵکەکە پێی قایل بوون و لە هەوا دەیانقۆزتنەوە. مافووری ئەسڵ نەک بە پەنجا رووبڵ بەڵکو بە هەزاران رووبڵیش لە کڕین نەدەهات. شۆخۆف مەراقی بوو دانەیێ لەو مافوورانە بە چاوی خۆی ببینێ.

ئەو هەموو ساڵەی ژیانی زیندان و ئۆردووگا، ئیڤان دنیسۆڤیچی وا راهێنابوو بیر لە داهاتووی خۆی نەکاتەوە، بیر لە ساڵێکی دی نەکاتەوە. لە خەمی باری گوزەرانی بنەماڵەکەیدا نەبێ. کاربەدەستانی سەرەوە بۆخۆیان مشووری هەموو شتێکیان دەخوارد، ئاوا پیاو ئاسوودەتر بوو. زستان دوای زستان و هاوین دوای هاوین رادەبردن و هێشتا دەبوو گەلێک ساڵی دیکەش لە بەندیخانەدا بێ. بەڵام کەڵکەڵەی ئەو مافوورانەی لە مێشکی نەدەچووە دەرێ.

پێدەچوو رێگایەکی ئاسان و ئەرخەیانی پارە پەیدا کردن بێ و رەنگە وا باش بێ ئەویش بێتە سەر خووی خەڵکی گوندەکەیان. بەڵام ئیڤان دنیسۆڤیچ لە دڵەوە هیچ کەیفی بەو کارە نەدەهات .ئەوە کاری کەسانی بێقوونەبان بوو، ئەوانەی دەیانزانی سمێڵی چ کەسێک چەور بکەن. شۆخۆف چل ساڵ لە تەمەنی رابردبوو، نیوەی ددانەکانی کەوتبوون و سەری رووتابۆوە بەڵام لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا نە بەرتیلی دابوو بە کەس نە بەرتیلیشی لەکەس وەرگرتبوو. تەنانەت لە ئۆردووگاش فێری ئەو تەڵەکەیە نەببوو.

دراوێک هەر وا بەئاسانی پەیدا بێ پووشێک ناهێنێ و چێژی ئەو پارەیەی نییە پیاو بە ئارەقی نێوچاوانی پەیدای بکا. ئەوە راستە کە دەڵێن «ئەوی با بیهێنێ هەر باش دەیبا». هێشتا لە دەست و مەچەکی خۆی رادەدی کار بکا. ئەگەر رۆژێک لێرە رزگار ببا، هیچ پیشەیەک وەک دروست کردنی سۆبە نەبوو. سۆبە و مەنجەڵ و تاوەی چاک دەکردنەوە. بەڵام ئەگەر پاش ئازاد بوون لە مافی هاوولاتیەتی بێبەش بکەن، ناتوانێ لە هیچ جێگایەک کار بدۆزێتەوە و نایەڵن بگەڕێتەوە زێدەکەشی، ئەودەم لەوانەبوو بۆ ئەوەی لە برسان نەمرێ، بە ناچاری روو بکاتە کاری نەخشکردنی مافووران.

***

قەتاری زیندانییەکان گەیشتبووە پێش پازگای کارگەی بیناسازی و لەوێ راوەستا. بەرلەوەی بگەنە وێستگەی کارەبا دوو پاسەوان بە پاڵتۆی کەوڵی درێژەوە لە زیندانییەکان هەڵبڕان و بەرەو بورجی دیدەوانی کە لەملاو ئەولای گۆڕەپانەکە بوون، وەڕێ کەوتن. زیندانییەکان تەنیا کاتێ دەیانتوانی پی بنێنە ناو گۆڕەپانەکەوە کە پاسەوانەکان لە بورجەکان بان. ئەفسەری پاسەوان بە خۆ و چەکی شانییەوە چووە پازگا. سۆبەی پازگا یەک بە لوولە، دووکەڵی لێ دەهاتە دەرو بە هەوادا بڵاو دەبۆوە. شەوانە کرێکارێکی ئازاد، بۆ کێشکی کەرستەکانی بیناسازی، لە پازگا دەخەوت.

بازنەی گەورەو سووری خۆرەتاو لە دوورەوە، لەوپەڕی عەردی کارگادا سەری لەنێو خەرمانەیەک لە تەمومژ وەدەر نابوو و بە تیشکی لاتەولاتی خۆی سەرانسەری ئەو گۆڕەپانەی، بە تێلبەند و دەروازەکانەوە، رووناک کردبوو. ئالیۆشا کە لە کن شۆخۆف راوەستابوو، تەماشایەکی خۆری کرد و روخساری گەش بۆوە. بزەیەکی هاتە لێوان. دەموچاوی چرچ و لۆچ ببوو؟ یەکشەممان لەگەڵ باپتیستەکانی دی وێردیان دەکرد. ئەمانە بە ژیانی ئۆردووگا سەخڵەت نەبوون و رووی خۆیان گرژ نەدەکرد.

پەڕۆکی دەموچاوی شۆخۆف، لە رێگایە بە هەڵمی هەناسەی تەڕ ببوو و ئێستا وەک پارچە سەهۆڵێک بە دەموچاویەوە بەستبووی. دایخزاند و لە ملی کرد. پشتی لە با بوو. هەستی بە سەرما نەدەکرد، بەڵام دەستەکانی لەو دەستەوانە تەنکانەدا کۆڵ ببوون و کەڵەموستی پێی چەپەی لەگۆ چووبوو. چەکمەی قاچی چەپەی لەبەر یەک چووبوو و کونی تێببوو. تا ئێستا دووجار بەرەکەی درووبۆوە.



بروسکی لە پشتی وەستابوو، تا نێو شانی، چڵی دەدان. چۆن کاری پێ دەکرا؟ چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا. لە دواوەی ریزەکە چاوی بە سەردەستە کەوت. تیۆرین پیاوێکی چوارشانەی دەموچاو پانکەڵە بوو. کابرایەکی مڕو مۆچ بوو و رووی خۆشی پێشانی کەس نەدەدا. بەڵام هەمیشە لە خەمی قووت و زەوادی ئەفرادی دەستەکەیدا بوو. دووەم خولی زیندانی دەکێشا. عومرێکی لە گرتووخانە رابواردبوو. هیچ شتێکی زیندان نەبوو نەیزانێ و نەیدیبێ.

لە ئۆردووگا، سەردەستە هەموو کەسی مرۆ بوو. سەردەستەی چاک لە باوک باشتر بوو. بەڵام ئەگەر لەداوی یەکێ لە ناجسنەکانیان هەڵەنگوتبای ملت بە هەش دەبوو. شۆخۆف لە ئۆردووگای «ئوست–ئیژما»وە تیۆرینی دەناسی. بەڵام لەوێ بەردەستی وی نەبوو. کاتێ بەندی ٥٨ بەرۆکی ئەوانیشی گرتەوە و لە ئۆردووگای ئاساییەوە گوێزراوە ئۆردووگای تایبەت، تیۆرین بۆ دەستەی خۆی هەڵیبژارد. شۆخۆف قەت رانەکێشرابووە بەردەم فەرماندەیی و بەشی بەرنامەڕێژی و لای سەرپەرشتیاری کارگە و ئەندازیارەکان. سەردەستە خۆی مشووری گشت ئەو کارانەی دەخوارد. وەک کێو سینگی خۆی بۆ کردبوونە قەڵغان. چاوێکی هەڵتەکاندبا یان بە قامک ئاماژەیەکی کردبا بەس بوو بۆ ئەوەی هەر کارێکی گوتبای بەدڵ و داو بۆی ئەنجام بدەی. لە ئۆردووگا دەکرا ئەوی پێت خۆشە کڵاوی لەسەر بنێی، بەڵام حیسابی تیۆرین جوێ بوو. ئەوە تاقە رێگای مانت بوو.

شۆخۆف بە تەمابوو لێی بپرسێ هەر دەچنەوە جێگاکەی دوێنێ یان بڕیار وایە لە شوێنێکی تر کار بکەن؟ بەڵام نەیدەوێرا فکری تیۆرین ئاڵۆز بکا. تازە مەترسیی کارکردن لە کۆمەڵگەی ئیشتراکییان لە کۆڵ ببۆوە، ئێستا بێگومان تیۆرین بەراوردی بەرهەمی ئەو کارەی دەکرد کە دەبوو بیکەن. جیرەی خۆراکی پێنج رۆژی داهاتوویان هەر بەو بەرهەمی کارەوە بەند بوو.

دەموچاوی تیۆرین کەمێک گڕوێ بوو. روو لە با، راوەستابوو و هەر پەکیشی پێنەدەکەوت. پێستی سوور و ئەستووری دەموچاوی هەر لە موورەی دار بەڕوو دەچوو.

زیندانییەکان دەستیان لێک دەخشاندن و پێیان لە عەرزی دەکوتان. بایەکە نەیدەخست. وێدەچوو پاسەوانەکان هەر شەش بورجی دیدەوانییەکانیان گرتبن. بەڵام هێشتا

روخسەتی چوونە ژووریان نەدابوونێ. (تەشقەڵە و گڕیشەیان نەدەبڕایەوە).

بەڵام هاتن! تەرح و دیداری سەرۆکی پاسەوانەکان و موفەتیشێک لە پێش پازگاوە پەیدا بوو. هەر کام بەرەو لایەکی دەروازەکە چوون و کردیانەوە.

«بە پێنج ریز، ڕێ، بکەن!»

زیندانییەکان دەتگوت لە بەر دەمیاندا سان دەبینن. کە لە دەروازەکە تێدەپەڕین، بێ ئەوەی پێیان بگوترێ، هەر کەس وە دوای کاری خۆی دەکەوت.

دیوار بە دیواری پازگاوە، نووسینگەی کارگا بوو. سەرپەرشتیاری کارگا لەوێ راوەستا بوو و بانگی سەردەستەکانی دەکرد. یەکێ لە سەرکرێکارەکان تەرەسێکی «دێر» ناو بوو، گەوادێکی هەژدە عەیار، هاتە لایان. بۆخۆشی زیندانی بوو، بەڵام وەک سەگی هار قاچ و قولی زیندانییەکانی دەگرت.

کاتژمێر هەشتی بەیانی بوو. لەوانەشە هەشت و پێنج دەققە، (ماتۆڕی کارەبا چەند چرکە لەمەوپێش فیکەی لێدابوو). پاسەوانەکان بە وردی ئاگاداری ئەوە بوون زیندانییەکان خۆ لە کار نەبوێرن و بۆ خۆ گەرم کردنەوە لە کەلێن و پەسیواندا خۆ مەڵاس نەدەن. بەڵام جارێ، رۆژێکی دوورودرێژیان لە بەر بوو و کەس گوێی نەدەدانێ. هەر کە دەگەیشتنە ناو عاردی کارگا، لە کوتە داران دەگەڕان. بە دزیی پاسەوانەکانەوە ئەو دارانەیان بۆ سۆبە دەبردنەوە ئۆردووگا.

تیۆرین بە پاڤولۆی یاریدەدەری گوت لەگەڵی بچێتە نووسینگە. سیزاریشیان لەگەڵ چوو. سیزار پیاوێکی سەنگین بوو. هەموو مانگان دوو جار لە دەرێڕا شتی بۆ دەهات و کێی پێ خۆش با چاوی پێدەکەوت. سکرتێرێکی ئاسایی بوو و لەبەردەستی کابرایەکدا کە پلانی کاری دەنووسی، کاری دەکرد.

ئەفرادەکەی تری دەستە لە چاو ترووکانێکدا پەرش و بڵاو بوون.

خۆرەتاوی سوور، لەوپەڕی گۆڕەپانی کاکی بە کاکیی کارگادا، لەبن پەردەیەک تەمومژەوە سەری وەدەر نابوو. بەفر قالبی خشتان و دیواری نیوە دانراوی داپۆشیبوون. هێندێک لەولاتر مەڵغە شکاوێک دەبینرا. پێمەڕەیەکیش لەسەر کۆمایەک ئاسنەواڵە کەوتبوو.



لێرەولەوێ زەوییان هەڵقەندبوو و ئەو ناوە پڕ لە قووڵکەو چاڵ بوو. خانووی تەعمیرگا هەر مابوو سەری بگیرێ و لەوێوە خانووی وێستگە دیار بوو کە تا نهۆمی دووەمی دانرابوو.

تا چاو هەتەری دەکرد زیرۆحێک بەدی نەدەکرا. تەنیا شەش پاسەوانەکە لە بورجی دیدەوانییەکاندا ئێشکیان دەگرت و چەند کەسێکیش لە پێش نووسینگە لێک خڕ ببوونەوە. بۆ زیندانی، ئەوکاتە باشترین کاتی رۆژ بوو. دەیانگوت سەرپەرشتیاری کارگا شەوێ دی کردبوویە هەرا کە بۆچی بەری بەیانان زوو پلانی کار نادەنە سەردەستەکان. بەڵام ئەو هەراو هوریایەی بە خۆڕایی بوو. لەشەوێکدا هەموو پلان و بەرنامەکان دەبوونەوە خشەخش.

کەواتە هێشتا زیندانی ئەو دەرفەتە کەمەی بەدەستەوە مابوو. لەو ماوەیەدا کە کاربەدەستان سەرقاڵی مشتومڕ بوون، پیاو دەیتوانی پەنایەکی چۆڵ بدۆزێتەوە و بەئاسوودەیی لینگی لێ راکێشێ. بۆ بێگاری کەرانە، کات زۆر بوو. خۆ ئەگەر پەنا سۆبەیەکت وەرگیر کەوتبا قیمەتی تەواو نەدەبوو. دەتتوانی پێپێچەکان دابکەنی، گەرمیان کەیەوەو بیانبەستیەوە. بەو شێوەیە تا ئێوارێ پێت گەرم دەمانەوە. بەڵام ئەگەر سۆبەش نەبا، دیسان ئەو دانیشتنە بۆخۆی دنیایەکی دێنا.

ئەفرادی دەستەی سەد و چوار چوونە خانووی تەعمیرگا کە پایزێ پەنجەرەیان تێگرتبوون. دەستەی سی و هەشتیش بلوکی بۆ دەبڕین. چەند دانەیەک لەو بلوکانە لێرەولەوێ لە قالباندا کەوتبوون و چەند دانەیەکیش بەقیتەوە دانرابوون. شیشە ئاسنەکانیش لەو گۆڕە بڵاو ببوونەوە. بانی تەعمیرگا بەرز بوو و عەرزەکەشی پارچە زەوییەکی رەق و رووت بوو. گەرم داهێنانی ئەستەم بوو، بەڵام بەهەر فێڵێک بێ گەرمیان داهێنابوو و بۆ رەژییش پەکیان نەدەکەوت. رەژی بۆ خۆ گەرم کردنەوەی ئەوان نەبوو، بەڵکو بۆ بەستنی قالبی کۆنکرێتەکان، ئەوەندی پێویستیان با، دەیاندانێ. (تێن پێویێکیشی لێبوو و یەکشەمان، ئەگەر زیندانییەکان کاریان نەکردبا، یەکێ لە کرێکارانی ئازاد نەیدەهێشت سۆبەکە بکوژێتەوە.)

هەڵبەت دەستەی سی و هەشت دەوری زۆپاکەیان دابوو و پێپێچەکانیان گەرم دەکردنەوە، بەڵام چاویان دەرێ! پیاو قوژبنێکیشی لەو خانووە وەگیر کەوتبا هەر چاک بوو.

شۆخۆف لە سەر قالبەدارێک دانیشت و پاڵی وە دیواری دا. بەو شەرواڵە دووبەرەوە کوێ مابوو لەسەری دانەنیشتبێ. کە پاڵی بە دیوارەکە دا، پاڵتۆو کەوایەکەی بە لەشیەوە نووسان و، شتێک لەلای چەپەی سینگی لە سەر دڵی ئاگای کرد. لەتە نانەکەی جیرەی بەیانی بوو کە بۆ فراڤینی هەڵگرتبوو. هەمیشە نانی زیادەی لەگەڵ تێشت دەخوارد. بەڵام ئەورۆ تێشتەکەی بەبێ نان خواردبوو و ئەو دەست پێوەگرتنەی بە خۆڕایی بوو. لە برسان زگی تێک قووپابوو و، حەزی دەکرد هەرلەوێ لەو قوژبنە گەرمەدا نانەکەی وەبەر گازان بدا. هێشتا زۆری بۆ نیوەڕۆیە مابوو، پێنج کاتژمێر.

بڕووسکەکەی پشتی ئێستا هاتبووە لاقەکانی و نەیدەتوانی بیانبزێوێ. بریا توانیبای بچێتە پەنا سۆبەکە.

دەستکێشەکانی لەسەر ئەژنۆی دانان. دوگمەی پاڵتۆکەی کردنەوە. رووبەندە سەهۆڵ بەستووەکەی لە ملی کردەوە، قەدی کرد و لە بەرکی شەرواڵەکەی راکرد. ئینجا نانەکەی کە دە نێو پەڕۆیەکی خاوێنی وەرگرتبوو، لە سەر کۆشی راگرت تا ورکەی لێ هەڵنەوەرێتە سەر عەرز، قەپاڵتەیەکی لێدا و سەبر سەبر دەستی بە جوینی کرد. نانەکەی دە نێو دوو پەڕۆیان نابوو و بە گەرمای لەشی خۆی نەیهێشتبوو سارد بێتەوە. هێشتا گەرم و نەرم بوو.

لە ئۆردووگا زۆر جار بیری لەوە دەکردەوە کە لە گوندەکەیان خەڵک چەند زۆریان خواردن دەخوارد! تاوە تاوە پەتاتە و بە مەنجەڵان «کاشا»(٧) و پێشتریش بە مەجوعەمان قاورمەیان لەسەر سفرە دادەناو تا زگیان دەقەڵشی شیریان دەخواردەوە. شۆخۆف لە ئۆردووگا بۆی دەرکەوت کە بە ڕاستی ئەوە دابودەستووری خواردن نییە. پیاو دەبێ بە هەموو هۆش و گۆشی خۆیەوە خواردن بخوات. وەک ئێستا، کە نانەکەی بە گازی ورد ورد دەپچڕی، بە زمان لەناو دەمیدا دەیسووڕاند و لێی دەگەڕا جوان بئەنجنێ و بخووسێ، جا بزانە ئەو نانە رەش و برش و فەتیرە چ تام و لەزەتێکی هەبوو. لەو هەشت ساڵ و چەند مانگەی بەندیخانەدا بڵێی هێشتا ژەمە نانێکی تێر بە زگی خۆی خواردبێ؟ نا، هەرگیز، بەڵام بۆ پارووە نانێکی نەمر نەژی چەندی ئارەق رشتبێ؟

شۆخۆف سەرقاڵی خواردنی نانەکەی بوو و بەتەنیشتیەوە، هەر لەو قولینچکەی خانووەکەدا ئەفرادەکەی تری دەستەی سەدوچوار دانیشتبوون.

***



ئۆستونیاییەکان، وەک دوو برای لە پشتێ، لەسەر بلۆکێک دانیشتبوون و پێکەوە جغارەیان دەکێشا. هەرتکیان کەڵەگەت و قژ بۆز بوون و لووتیان قەڵانگی و چاویان گەورە بوون. دەتگوت سێوێکن کەرت کراون. سەردەستە قەت لێکی هەڵنەدەبڕین. هەرچی وەریانگرتبا پێکەوە بەشیان دەکرد، تەختەکانیشیان بە تەنیشت یەکەوە بوون. لە نێو ریزدا، کاتی سەرژمێری، یان شەوێ کە دەچوونەوە خەوگە، دایمە پێکەوە سرتوخورتیان بوو. دەیانگوت یەکەمیان ماسیگر بووەو ئەوی دی کە مێرمنداڵێک بووە، بەر لە هاتنە سەر کاری حکومەتی شۆڕاکان لە ئۆستونیا، دایک و باوکی دەیبەنە سوێد، بەڵام دواتر بە دڵخوازی خۆی دەگەڕێتەوە ئۆستونیا تا لە زانکۆ بخوێنێ.

ئێستا وای لێهاتووە دەڵێن گرینگ نییە پیاو لە کوێرا هاتبێ، هەموو شوێنێک چاک و خراپی لێن. بەڵام شۆخۆف لەو هەموو ئۆستونیاییەی دیتبوونی، قەت تووشی یەکی وا نەببوو خراپ بێ.

هەروا لەسەر بلۆک و قالبەکان، یان لەسەر زەوی دانیشتبوون. بەیانیان مرۆ تاقەتی قسەکردنی نەبوو. هەموویان قرو قەپیان لێکردبوو. فتیۆکۆفی شرەخۆر لوێچێکی قوونچکە جغارە کۆ کردبوونەوە (قوونچکە جغارەی لە ناو بەڵغەمیشدا دیبا، دە سەریەوە نەدەچوو) و خەریک بوو تووتنەکانی بەتاڵ دەکردن و لە کاغەزێکی وەردەپێچان. فتیۆکۆف لە «دەرێ» سێ منداڵی هەبوون، بەڵام لە کاتی گیرانیدا دادگا بە شیاوی پلەی باوکایەتی نەزانیبوو و منداڵەکانیان لێئەستاندبوون، ژنەکەشی مێردی کردبۆوە. لەدەرێ کەسی نەبوو شتی بۆ بنێرێ.

گەمیەوان کە هەروا خێسەی دابۆیە، هاواری کرد:

«ئەوە چ دەکەی؟ ئەو پاشەڕۆکە گەندو گواوییانەت بۆ خڕ کردوونەوە؟ سفلیس دەگری ها! فڕێیان دە!»

گەمیەوان وا راهاتبوو بە سەر خەڵکدا بقیژێنێ و فەرمانان بدا. بەڵام فتیۆکۆف گوێی نەدایە.

گەمیەوانیش کەس شتی بۆ نەدەنارد.

ئینجا فتیۆکۆف بە پێکەنینەوە –چەند ددانی کەوتبوون– رووی لە گەمیەوان کرد و گوتی: «راوەستە جەنابی گەمیەوان، با هەشت ساڵان بکێشی، بۆ خۆت لەوە خراپتر دەکەی. لێرە لە تۆشمان کەللەڕەقتر دیون.»

ئەو قسەیەی فتیۆکۆف زیاتر لە سەر خۆی راست بوو. گەمیەوان رەنگبوو جارێ وای لێبەسەر نەیێ.

سێنکا کلێڤشین گوتی: «چ بووە؟ چ بووە؟» سێنکا گوێی گران بوون و باش گوێی لە قسەکانیان نەدەبوو. پێی وابوو لەبارەی کێشەی بەیانیی گەمیەوانەوە دەدوێن. گوتی: «نەدەبوو بەو شێوەیە بە سەریاندا بنەڕێنی.» بە پەرۆشەوە سەری راوەشاند و گوتی: «زۆر گرینگ نەبوو.»

سێنکا مرۆیەکی کەمدوێ بوو، ژیانێکی تاڵی رابواردبوو. ساڵی چل و یەک پەردەیەکی گوێچکەی دڕابوو. ئەودەم لە بەندیخانەیان کردبوو، بەڵام هەڵاتبوو. ئینجا ئەڵمانییەکان گرتبوویان و پاشان ناردبوویانە «بوخنوالد». لە ئۆردووگای بوخنوالد بە مۆجیزە زیندوو ماو ئێستا وا لێرە، بێدەنگ و بەستەزمان رۆژانی بەندیخانەی تێپەڕ دەکردن. سێنکا دەیگوت «زیندانی ئەگەر هەرا بنێتەوە سەری بە هەش دەبێ.»

راستی دەکرد. وا چاک بوو پیاو دەست بە کڵاوی خۆیەوە بگرێ و خەریکی کاری خۆی بێ. ویستبات کەڵەوەکێشی بکەی ئەستۆ و گردەڕانیان هورد دەکردی. ئالیۆشا دەموچاوی لەنێو لەپی دەستان گرت. نزای دەکرد.

شۆخۆف نانەکەی هەموو خوارد. بەڵام لێوارەکانی کە لە هیلال دەچوو، هێشتەوە. بۆ لێستنەوەی بنی هەوڕ هیچ ملاکێک لەو پەلکە نانە باشتر نەبوو. بۆ فراڤین لە پەرۆیەکەی وەرپێچایەوەو لە گیرفانی لاتەنیشتی نا. قۆپچەکانی داخستنەوە. ئێستا بۆ هەر جێیەکیان لێخوڕییان سازو تەیار بوو. بەڵام ئەگەر دیسانیش وە درەنگی کەوتبان باشتر بوو.

ئەفرادی دەستەی سی و هەشت هەستان. چەند کەسێکیان چوونە سەر لێکدەری چیمەنتۆ. چەند کەس چوونە دەرێ بۆ ئەوەی ئاو بێنن. ئەوانی دیکەش دەستیان بە دروست کردنی تۆڕی شیشە ئاسنان کرد بۆ کۆنکرێتی موسەلەحە.

تیۆرین و پاڤلۆ دیار نەبوون. هەرچەند بیست دەقەقە پتر نەبوو دانیشتبوون و لەو رۆژە کورتانەی زستانیشدا تا سەعات شەش زیاتر کاریان نەدەکرد، بەڵام بۆ ئەفرادی دەستەی سەد و چوار خۆگنخاندنی وا دەرفەت بوو و شتی وا کەم بووزی دەخوارد. دەتگوت دەمەو ئێوارەیە.



کیلگاسی لاتڤی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: «زۆر لەمێژە نەیکردۆتە تەمومژ.» کیلگاس پیاوێکی کوڵمە ئاڵی قەڵەو و بە کەیف بوو. لەسەری رۆیی: «ئەو ساڵ یەک جاریش نەیکردە تەمومژ! ئەوە چ زستانێکە؟»

هەندێکی تر بە ئاخوداخەوە گوتیان: «ئەرێ.. تاقە یەک جاریش.. تاقە یەک جاریش..»

کە لەو ناوە دەبووە تەمومژ، پاسەوانەکان نەدەوێران لە خەوگەیان بێننە دەرێ، نەخوازەڵا کاریان پێ بکەن. ئەگەر لە خەوگەوە بۆ چێشتخانە پەتێکیان رایەڵ نەکردبا، لە تۆف و بارِندا مرۆ رێگای لێدەگۆڕا. خۆ ئەگەر زیندانیی رێ گوم کردوو لە سەرمان رەقیش هەڵاتبا، کەس بە هانایەوە نەدەچوو. بەڵام ئەگەر زیندانی هەڵاتبا چییان دەکرد؟ جاروبار ئەوە رووی دەدا. تۆفان گێژەوی بە بەفر دەکرد و رە هەوای دەخست کە نوا نوا دەکەوتە سەر زەوی و جاری وابوو بەرزایی ئەو نوایانە رەسەر تێلدڕووەکان دەکەوت، هێندێک زیندانی بە سەریدا دەرباز دەبوون، بەڵام نەیاندەتوانی زۆر لە ئۆردووگا دوور بکەونەوە.

کە بە وردی بیرت لێدەکردەوە، دەردەکەوت تەمومژ زۆریش بە قازانج نەبوو. زیندانییەکانیان لە خەوگەدا حەپس دەکردن. رەژوو درەنگ دەهات و خەوگە بەرە بەرە دەبووە سڕسڕخانە. ئاردیان لێدەبڕا و نانیش دەچووە پشتی شێران. خواردنی گەرمیان مەگەر بە خەون دیبا. کاربەدەستان پەکیان پێنەدەکەوت ئاخۆ تەمومژ چەندە دەخایەنێ، یەک دوو رۆژ یان حەفتەیەک، چونکە وەبەر رۆژانی پشوودانیان دەخستن. ئەوجار زیندانی دەبوایە بە بارتەقای رۆژانی تەمومژاوی، یەکشەممان کار بکا.

بەو حاڵەشەوە زیندانییەکان مەگیرانییان لە بەفر و تەمومژ دەکرد و دەپاڕانەوە بباریێ. دەگەڵ هەر سروە بایەک گشتیان چاویان لە ئاسمان دەبڕی: «خۆزگە باراندبای، چاکیشی باراندبا!» مەبەستیشیان بەفر بوو. بەڵام خەیاڵیان خاو بوو. زۆربەی وەختان بارِنێکی دەکردو نەیدەکردە تۆفان.

یەکێ لە زیندانییەکان ویستی بچێتە پەنا سۆبەی دەستەی سی و هەشت، بەڵام وەخۆیان نەکرد و گەڕایەوە. تیۆرین هاتەوە. رووی گرژ بوو. دیار بوو کارێک هەیە و دەبێ زوو دەستی پێبکەن.

تیـۆرین چاوێکی بە دەوروبەری خـۆیدا خـشـاند و گـوتی: «زۆر بـاشـە، هەمـوو لێـرەن؟» سەرژمێریی نەدەویست. ئەفراد لەوێ بەدەر، لەکوێ بوون؟ بە پەلە دەستـووری کـارەکـانی دانێ. بە ئوستونیاییەکان و کلێڤشین و گۆپچیکی گوت کە لێکدەری چیمەنتۆکە ببەنە وێسـتگە. دەرکـەوت کـاری دەسـتـە تەواو کـردنی خـانووی وێسـتگەیە کـە لە پایزەوە بە نیـوەچڵی مـابۆوە. دوو کـەسی رەگـەڵ پاڤـولۆ دا بچن لە عـەمـبـار ئامـرازەکـان بێنن. چوار کـەسی نارد بەفـری نێـو دەرگـای وێسـتـگە و مـاتـۆڕخـانە و پەیژەکـان بماڵن. دوو کـەسی راسـپـارد سـۆبەکـە هەڵبکەن و لەسـەر رێی خـۆیان هەر کـوتە دارێکی وەبەر چاویان هات لەگەڵ خۆیان ببەنە وێستگە. بڕیار درا یەکێک بە فەرغوون چیمەنتۆ بکێشێ، دوو کەس زیخ بێنن و کەسێکیش دەبوو بە کوتک زیخەکە بکوتێ و بەفری لێ بکاتەوە.

تەنیـا دووکەس، شۆخۆف و کـیلگاس، کرێکارە پسپۆڕەکـانی دەسـتـە مـابوون پلانی کـار وەربگرن. سەردەستە گـازی کـردن و گـوتی: «ئێ، کوڕینە! (تیـۆرین بە تەمەن نەبوو، بەڵام ئەفرادی دەستەکەی بە «کوڕینە» بانگی دەکردن) دوای پشووی فراڤین ، ئێوە دیوارەکـانی نهۆمی دووەم کە پایزێ دەستەی شەش کاریان لەسەر کردوون دادەنێن، بەڵام ئێستا کاری ئێوە ئەوەیە پەنجەرەکانی ماتۆڕخانە بگرن. سێ پەنجەرەی گەورەی تێدان کە دەبێ زوو بە شـتـێـک بگیـرێن. چەند کـەسـتـان دەنێـرمـە یاریدەی، بە بڕوای ئێـوە بە چی بیـانگرین؟ چیمەنتۆکە لە ماتۆڕخانەدا دەگرینەوە و ئەگەر گەرمی دانەیەنین، لە سەرمان رەق دەبینەوە. تێگەیشتن؟»

دەیویست شتێکی دیکەش بڵێ کە گۆپچیک پەیدا بوو.- گۆپچیـک هەرزەکارێکی شازدە ساڵەی سوور و سپی بوو- بۆ گـازندە هاتبوو. لە سەر لێکدەری چیمەنتۆ لەگەڵ ئەفرادی دەستەیەکی تر لێی ببووە شەڕ. تیۆرین لەگەڵی رۆیی.

ئێسـتا ئیـتر کـارکردن لەو سەرماو سایەقەدا هێندەش ئەستەم نەبوو. دەیانزانی لە کوێوە دەست پێبکەن، هەر ئەوەندە دەستیان پێکردبا.

شـۆخـۆف و کـیلگاس سـەرنجـێکی یەکـتـریان دا. زۆریان پێکەوە کـار کـردبوو و چونکە هەرتک، مرۆی ژێهاتی بوون، چاویان بە سەر یەکترەوە بوو. شۆخۆف دارتاش و کیلگاس وەسـتـای دیوار بوو. لەو بەفرەدا پەیداکردنی شـتـێـک کە بکرابا پەنجـەرەکـانی پێ بگری، ئاسان نەبوو. کیلگاس گوتی: «ئیڤان! لە کن تەختە قالبەکان لوولە لبادێکی بن میـچم پێشک دێ. بۆ خۆم لەوێم شاردۆتەوە، لە لاقان وەرێنە با بڕۆین.»



کیلگاس خەڵکی لاتڤیا بوو، بەڵام رووسی وەک زمانی زگماکی خۆی دەزانی. لەدێبەری زێدەکـەی کـۆمـەڵێک کـۆچەری دەژیان (ئیـمـاندارانی کـۆن)[٨] کـە بە منداڵی زمـانی رووسـییـان فـێر کـردبوو. تەنیـا دوو سـاڵ بوو گـیـرابوو، بەڵام پیـاوێکی لێوەشـاوە بوو، دەیزانی دەبێ خۆت پشتی خۆت بخورێنی. کیلگاس و شۆخۆف بە هەردووکان ناوێکیان هەبوو و بە «ئیڤان» گازی یەکتریان دەکرد.

بۆ دۆزینەوەی لبادەکـە وەڕێ کـەوتن. شـۆخـۆف سـەرەتا چووە بەشـە نیـوە سـازکراوەکـەی خانووی تەعمیرگا تا مـاڵنجەکەی بێنێ. ماڵنجی سووکەڵە و لە دەستان خۆش بۆ کاری وەستایی ئامرازێکی گرینگ بوو. لە هەمـوو کارگاکاندا رێسا وابوو زیندانی بەیانان هەچ ئامرازێکی وەری گرتبا دەبوو شەو بیباتەوە عەمبار. جا ئیتر رۆژی دواتر چ ئامرازێکی دەکەوتە دەست، خۆی و بەختی خۆی بوو. شۆخۆف جارێک دڵی بەرپرسی ئامرازخانەی نەرم کـردبوو و باشـتـرین مـاڵنجی هێنابوو. لەو کـاتەوە هەر شـەوەی لە شـوێنێک دەیشـاردەوە و هەر کـاتێک کـاری بەننایی هەبا، دەچوو دەیهـێنا. ئەگـەر بردبایاننە کۆمەڵگەی ئیشتراکی تازە دەستی وێڕا نەدەگەیشت. بەردێکی لابرد، دەستی لە کونێک رۆکرد. ماڵنجەکە لەوێ بوو، پڕی دایە.

شۆخۆف و کیلگاس لە تەعمیرگا وەدەر کەوتن. لەگەڵ هەر هەناسەیەک باقەیەک هەڵمی چڕیان لەدەم دەهاتە دەرێ. بازنەی بێ تیشکی خۆرەتاو لە ئاسۆی تەماویدا بەرز ببۆوە. دەتگوت چەندین کۆڵەکەی تیرۆژ لە هەر دوو لای خۆرەوە بەرز بوونەتەوە. شۆخۆف سەری راوەشـاند و گـوتی: «دەڵێی لەوێش تیـرەگـیـان چەقـاندوون.» کـیلگاس گـوتی: «تا ئەوکاتەی تێلبەندیان لێنەئاڵاندوون، مەترسێ.» ئینجا پێکەنی.

کـیلگاس نەیدەزانی یەک قـسـەی جیـددیش بکا. لەبەر ئەوە ئەفـرادی دەسـتـە هەمـوو خۆشـیـان دەویست و لە لای لاتڤـیـیـەکـانیش تا بڵـێی خـۆشـەویست بوو! کـابرایەکی دەستڕۆیشـتـوو بوو، هەمـوو مـانگێک دوو جێـیـان شت بۆ دەنارد. سـاغ و بەدەمـاغ دیار بوو، هیچ گوێی بەوە نەدەبزووت لە ئۆردووگادا دەژی. هەر کەسی دیکەش لە جێگای ئەو با هەروا نوکتەباز و مەشرەف خۆش دەبوو.

کارگا عـەرزێکی بێ سنووری هەبـوو. زۆری دەبرد تا لەوسەریەوە دەچوونە ئەوسەری. لە رێگادا تووشی چەند زیندانیی دەسـتـەی هەشـتـا و دوو بوون کـە کـاری هەڵکەندنی

قوولّکانیان پێ سپاردبوون. قوولّکەکان زۆر گەورە نەبوون، نیو گەز لە نیو دا و نیو گەزیش قوولّ، بەلاّم عەرزەکەی هاوینانیش وەک جگ ڕەق بوو ئێستا بەو شەختە و بەستەلّەکە هەلّکەندنی مەحالّ بوو.

کە پاچت دادەوەشاندێ، لەسەر سەهۆلّ هەلّدەخلیسکا، دەمەکەی ئاورینگی لێهەلّدەبوو و عەرزەکەش تۆزقالّێکی لێنەدەبۆوە. نە پەنایەک هەبوو خۆی تێدا گەرم بکەنەوە نە دەشیانتوانی قوولّکەکان جێ بێلّن. تاقە ڕێگای خۆ گەرم کردنەوە ئەوە بوو بە کولّنگەکە بکەویە وێزەی ئەو بەستەلّەکە.

شۆخۆف یەکیانی دەناسی -کابرایەکی خەلّکی ڤیاتکا بوو- ئامۆژگاری کرد کە: «گوێ بگرە، هاوڕێ، بۆ ئاگر لە سەر ئەو قوولّکانە ناکەیەوە تا سەهۆلّەکەی بتوێتەوە؟»

ڤیاتکاییەکە گوتی: «لێناگەڕێن، ئاوردوومان نادەنێ.»

«خۆتان پەیدا کەن.»

کیلگاس تفی ڕۆکرد و گوتی: «ئەوە دەلّێی چی، ئیڤان؟ ئەو سەردەستانە ئەگەر تۆزقالّێکیان بەزەیی بەو خەلّکەدا هاتباوە، بەو سەرماو سۆلّە نەیاندەناردن قوولّکان هەلّکەنن.» لەبەر خۆوە چەند جنێوی دان و بێدەنگ بوو. لەو تۆف و سەرمایەدا پیاو قسەی بۆ نەدەهات. ڕۆیشتن تا گەیشتنە قالبەکان کە بەفریان لەسەر کەوتبوو.

شۆخۆف حەزی دەکرد لەگەلّ کیلگاسدا کار بکا. تاقە عەیبی کیلگاس ئەوە بوو جغارەی نەدەکێشا و ئەو شتانەی بۆی دەهاتن تووتنیان لەگەلّ نەبوو. لبادەکەی نیشانە کردبوو. تەختەیەکیان هەلّدایەوە، ئینجا تەختەیەکی تر و ئەوجار لبادەکە وەدەرکەوت. دەریانهێنا. بەلاّم چۆنیان هەلّگرتبا؟ پاسەوانی بورجی دیدەوانی دەیدیتن، بەلاّم نا، لێیان خاترجەم بوون... پاسەوانی بورجی دیدەوانی بە چوار چاوان سەرنجی تێلبەندەکانیان دەدا نەکا یەکێک رابکا. لە گۆڕەپانەکەدا هەموو تەختەکانیشیان بۆ سووتاندن بردبان، ئاگایان لێنەبوو، لە ڕێگایەش پاسەوانەکان خۆیان تێنەدەگەیاندن. بۆ خۆشیان لە دارو تەختان دەگەڕان بۆ سۆبەی خۆیان. زیندانی و سەردەستەکانیش کاریان پێنەبووی. تەنیا سەرپەرشتیاری کارگا کە خۆی زیندانی نەبوو لە خەمی کەرەستاندا بوو، «دێر»ی سەرکرێکاریش کە خۆشی زیندانی بوو. زیندانییەکی تریش بە ناوی شکوورۆ پاتێنکۆ،



بوودەلّەیەکی بە بۆلّە بۆلّ کە سێسەرەی لەسەر ئەو تەختانە هەلّنەدەگرت. لەوانەبوو ئەو شکوورۆ پاتێنکۆ یە ئەگەر لبادەکەی پێ دیبان، گوێی گرتبان.

شۆخۆف گوتی: «برۆنێ، ڤانیا، نابێ لبادەکە بە پانەوە بەرین. وا چاکە لوولی دەین. ئاوا ئەو خۆڕییە نازانێ چمان پێیە.»

بیری چاک بوو. لبادەکە جێدەستی نەبوو. لە دوو لاوە گرتیان و ڕۆیشتن. لە دوورڕا دەتگوت کەسێکی دی شان بە شانیان دەڕوا. «بەلاّم ئەگەر سەرپەرشتیار لە پەنجەرەوە بمانبینێ پێدەزانێ.»

کیلگاس گوتی: «دامنا دیتنی، چمان لێدەکا؟ دەلّێین ئەو لبادە لەوێ کەوتبوو، ئێمەش هەلّمانگرتەوە و کەسیش دەنگی نەکرد.»

راستی دەکرد.

پەنجەی لە نێو دەستکێشەکانیدا سڕ ببوون، چووبوون. سەرما بە چەکمەی قاچی چەپەیدا دەهاتە ژوور. بەو سەرما و سۆلّە لە هەموو شت گرینگتر چەکمە بوو. دوای دەست بە کارکردن وردە وردە گەرم دادەهاتن.

بەسەر بەفری سپیی یەکدەستدا ڕۆیشتن. شوێنی فەرغوونێک لە عەمبارەکە تا وێستگەی کارەبا دیار بوو. کەوابوو چیمەنتۆیان بردبووە وێستگە. وێستگەی کارەبا لەسەر تەپۆلّکەیەک و لە سەرپەڕی گۆڕەپانەکە دروست کرابوو. لەمێژ بوو کەس هاتوچۆی نەکردبۆیە و بەفری دەوروبەری، شقلّی نەشکابوو. بەلاّم ئێستا شوێنی فەرغوون و شوێن پێیەکان نیشانەی ئەوە بوو کەسانێک بەوێدا سەرکەوتوون. لەدەوری خانووەکە خەریک بوون بەفریان دەمالّی تا ڕێگای لۆرییەکان بکەنەوە.

ئەگەر ئامێری بالاّبەر کاری کردبا باش بوو، بەلاّم مەکینەکەی سووتابوو و بەو زووانە چاک نەدەبۆوە. کەوابوو هەموو شتێک، لە چیمەنتۆوە بگرە تا کەرپووچ، دەبوو بە دەست بیبەنە نهۆمی دووەم.

هێسکبەندی ڕەنگ خۆلّەمێشیی وێستگە دوو مانگ لە ناو بەفردا مابۆوە. ئێستاش دەستەی سەد و چوار هاتبوون و ئاخۆ چ شتێک وای لێدەکردن کار بکەن؟ هەناوی خالّی

و ساردو سڕیان... سەرما کوشندە بوو. ئەنوایەکیان شک نەدەبرد. ئاگرێک نەبوو. بەڵام هاتبوون، کەوابوو هەموو شتێک گیانی دەهاتەوە بەر.

لێکدەری چیمەنتۆیان ڕاست لەبەر دەرگای خانووەکە و لەسەر ڕێی ماتۆڕخانە دانابوو، بەڵام لەبەر یەک هەڵوەشابوو. لێکدەرەکە تێک چووبوو و شۆخۆف بە دووری دەزانی چاک بێتەوە. سەرەڕای ئەوەی هەر کەس کاری خۆی دەکرد، بەڵام سەردەستە لە پەستا بە سەریدا دەقیژاندن. شۆخۆف و کیلگاس بە خۆ و لبادەکەوە چوونە ماتۆڕخانە. سەردەستە بە دیتنیان دڵی خۆش بوو و فەرمانی کارێکی دیکەی پێدان. بە شۆخۆفی گوت لوولە سۆبەکە دابمەزرێنێ و کیلگاسیشی ڕاسپارد لێکدەری چیمەنتۆکە لەبەر یەک بنێتەوە. ئوستونییەکانیشی ناردنە یاریدەی. تەورێکی بۆ شکاندنی تەختە دا بە سێنکا. لبادەکە لە پەنجەرەکان گەورەتر بوو و دەبوا بە تەختە قایمیان کردبا. بەڵام تەختەیان لەکوێ هێنابا؟ سەرپەرشتیاری کارگا ڕۆحی دەگەڵ پارچە تەختەیەک دەردەچوو. تیۆرین و ئەوانی دی چاویان لە دەوروبەری خۆیان گێڕا. تاقە ڕێگایەکیان لەبەر بوو، ئەویش دەرێنانی تەختەی پەرژینی پلیکانەکانی قاتی دووەم بوو. ئەودەم لە سەرکەوتن و هاتنەخواردا مرۆ ئاگادار نەبا سەرەنگرێ دەبوو. بەڵام چارەی دیکەشیان نەبوو.

***

ڕەنگە ئەو پرسیارە بێتە پێش کە ئاخۆ چ شتێک وای لە زیندانی دەکرد دە ساڵ لە ئۆردووگایەکدا کاری زۆرەملێ بکا؟ مەگەر نەیدەتوانی خۆی بگنخێنێ و بەخۆ خافلاندن ڕۆژ ئاوا بکا و بۆخۆی بحەسێتەوە؟ بەڵام مەسەلەکە هەروا سووک و ئاسانیش نەبوو. کاربەدەستان لەبەر ئەوە دەستەی کارکردنیان پێکهێنابوون. ئەو دەستەیان لەوانەی «دەرێ» کە دەستەی ئازاد بوون و ئەفرادەکانیان هەرکام مووچەی خۆیان هەبوو، جیاواز بوون. لە ئۆردووگا ئەفرادی دەستە، واتە زیندانییەکانیان تێکبەردەدان و سەرینی خاترجەمییان وەبن سەری کاربەدەستان دەدا. بە جۆرێک کە سەرپێچیکردنی یەکێک دەبووە هۆی ئەوەی تەواوی ئەفرادی دەستەیەک برسیەتی بکێشن. (سەگباب، تۆ کاری خۆت ناکەی، دەبێ لە سۆنگەی تۆوە ئێمەش برسیەتی بکێشین. دەبێ کار بکەی کەران بابگاو!)

ئەو جار ئەگەر کارێکی زەحمەتیش هەبا، وەک ئێستا، پیاو نەیدەتوانی دەست لەسەر



دەست دابنێ، خۆشیت باو ترشیت با دەبوو بجووڵێیەوە. یان هەتا زووە سۆبەکە وەکار بخرێ، یان هەموو لە سەرمان ڕەق دەبوونەوە.

پاڤولۆ ئامرازەکانی هێنان. ئێستا هەر کەس چ ئامرازێکی دەویست هەڵیدەگرت. پاڤولۆ لوولەشی هێنابوو. دامەزراندنی لوولە پێویستی بە ئامرازی تەنەکەسازی هەبوو. بەڵام شۆخۆف بە چەکوش و تەشوێیەکی بچووک کە لەوێ بوون، کارەکەی رادەپەڕاند. بەرە دەستی پێکدا دان. لوولەکانی دە سەریەک کردنەوە. لێوەکانی ڕاستەو پاستە کردنەوەو بە چەکوش کوتانی. ماڵنجەکەی هەر لەوێ لەو نزیکانە شاردبۆوە. گەرچی کەسی بێگانەی لێنەبوو، بەڵام لەوانەبوو یەکێ لە ئەفرادی دەستەکەی خۆیان، لەگەڵ ماڵنجی خۆی بیگۆڕێ. تەنانەت نەدەبوو پێشانی کیلگاسیشی بدا.

شۆخۆف ئێستا تەنیا بیری لە شتێک دەکردەوە ئەویش ئەوە بوو چۆن دووکەڵکێشەکە دابمەزرێنێ و نەیەڵێ سۆبەکە دووکەڵ بکا. گۆپچێکی نارد دیوی دەرەوەی دووکەڵکێشەکە لە پەنجەرە ببەستێ.

لە سووچێکی خانووەکەدا سۆبەیەکی دیکەی لێبوو، جەهەننەمەیەکی گەورەی هەبوو کە بە خشتە دووکەڵکێشیان بۆ دروست کردبوو. وەرەقە ئاسنێکی قاڵ بۆوەش لەوێ بوو کە سەهۆڵی زیخەکەیان پێ دەتواندەوە. پێشتر ئەو سۆبەیان هەڵکردبوو، گەمیەوان و فتیۆکۆف بە زەنبەڵ زیخیان دەکێشا. بۆ زەنبەڵ کێشان پێویست نەبوو پیاو سەری لە کاری بەننایی دەربچێ. لەبەر هەندێ تیۆرین ئەو کارەی بە کەسانێک دەسپارد کە پێش هاتنە ئۆردووگا بۆخۆیان خاوەن پلە و پایەیەک بوون. فتیۆکۆف سەردەمانێک کاربەدەستێکی زلی یەک لە ئیدارەکان بوو و بە ماشێنی خۆی هاتوچۆی دەکرد.

سەرەتا فتیۆکۆف جلغەی لە گەمیەوان دەگێڕا، بەڵام کە یەک دوو مستە کۆڵەی گەمیەوانی بەر فلچی کەوت وازی لێهێنا و ئێستا هەردووکیان بەبێ قڕە کاری خۆیان دەکرد.

ئەفراد بە بیانووی زیخ هێنان دەیانویست خۆ لە سۆبەکە نزیک بخەنەوە، بەڵام تیۆرین لە سۆبەی دەپڕینگاندنەوە:

«جارێ با کارەکان وەگەڕ بکەون، ئەگینا واتان لێدەکەم سەرماتان لە بیر بچێتەوە!»

تیۆرین هەر لە سەرەتاوە ئەفرادەکەی چاوترسێن کردبوو.

سەرما کاری لە ئێسکی پیاو دەکرد، بەڵام کەس نەیدەوێرا قسە لە قسەی بکا. هەموو بە دوای کاری خۆیان کەوتن.

شۆخۆف گوێی لێبوو کە تیۆرین بە چپە بە پاڤلۆی گوت: «تۆ لێرە بە، من دەچم راپۆرتی کار جێبەجێ دەکەم.»

راپۆرتی کار لە خودی کارەکە گرینگتر بوو. سەردەستەی چازان دەبوایە لە کاتی راپۆرت داندا هۆش و گۆشی خۆی بەتەواوی گردەو بکا. جیرەی خۆراکیان بەو راپۆرتەوە بەند بوو. ئەگەر کار بەنیوەچڵیش مابایەوە دەبوو وایان تێبگەیەنێ کە لێبوونەتەوە. ئەگەر بەرهەمی کارەکە کەم بوایە تا بۆی کرابا تێی دەگرت. ئەو کارە لێزانی دەویست و دەبوو بەرنامەنووسان لەگەڵت پێک بێن، کە دیارە ئەوەش بەدەستی خاڵی نەدەکرا.

ئەو راپۆرتانە لە ئاکامدا بە قازانجی کێ تەواو دەبوون؟ بە قازانجی ئەوانەی سەرچۆپی و گاوانیی کاروباری ئۆردووگا بەدەست خۆیانەوە بوو. لەو رێگایەوە هەزاران رووبڵیان هەقدەستی زیادە وەردەگرت کە بە شێوەی پاداش دەچووە گیرفانی کەسانی وەک ڤولکۆڤی، بە خۆی و بەو قەمچییەیەوە. لەو نێوەدا دووسەد گرام نانی شەوەکە دەگەیشتە دەست زیندانی کە مان و نەمانی بەو نانەوە بەند بوو.

***

دوو سەتڵیان ئاو هێنا، بەڵام لە رێگایە ئاوەکە بەستبووی. پاڤلۆ زانی ئەو کارە کەڵکی نییە. وا چاک بوو هەرلەوێ بەفریان لەسەر سۆبە تواندبایەوە. سەتڵەکانیان لەسەر سۆبە دانان.

گۆپچیک کوتە فافۆنێکی نوێی، لەوانەی کە سیمکێشی پێدەکەن، هێنا و گوتی: «ئیڤان دنیسۆڤیچ! ئەوە بۆ کەوچک سازکردن دەبێ. فێرم دەکەی چۆن کەوچک دروست بکەم؟»

ئیڤان دنیسۆڤیچ خۆشی لەو کورە گورج و گۆڵە دەهات. (کورەکەی خۆی بە منداڵی مردبوو و ئێستا دوو کچی عازەبی لە ماڵێ بوون). گۆپچیک بە تاوانی بردنی شیر بۆ پارتیزانەکانی «بەندرا»[(٩)] لە لێرەوار، گیرابوو. بەبێ لەبەر چاوگرتنی تەمەنی، موحاکەمەیان کردبوو. وەک گیسکی بزۆز لە دەوری مرۆ هەڵبەز دابەزی دەکرد و بەو ئاکارانەی هەمووی وە پێکەنین دەخستن. بەڵام دمبەردووکە و پیتۆڵیش بوو. ئەو خۆراکەی بۆیان دەنارد، شەوانە بەتەنێ دەیخوارد. لەوە زیاتر چاوەڕوانی چی لێدەکرا؟ بۆ سازکردنی



کەوچک هێندێکیان لە فافۆنەکە کردەوە و لە پەنایەکدا شاردیانەوە. شۆخۆف بە دوو پارچە تەختە جێ پێی دروست کردو گۆپچیکی نارده سەرێ تا دووکەڵکێشی سۆبەکە قایم بکا. کوریژگە وەک سمۆرە وەسەر تەختەکە کەوت. چەند بزماری داکوتان، تێلی لێهاڵاندن و لوولەکەی قایم کرد. ئینجا شۆخۆف دەستبەکار بوو و هەندێکی لوولەی تر دەسەر خستەوە تا دووکەڵەکە بچێتە دەرێ. ئەورۆ بای نەدەهات، بەڵام رەنگبوو سبەی بیکاتەوە باو بۆران و ئەو پارچە لوولەیە نەیدەهێشت دووکەڵ بگەڕێتەوە. سۆبەکەیان بۆخۆ بوو و نەدەبوایە هەروا بە ترەکەڵەک بیکەن.

سێنکا کلێڤشین تەختەکانی ئامادە کردبوون. بە گۆپچیکیان گوت بچێتە سەرێ و تەختەکان دابکوتێ. هەتیوی لەچەر بە قیژە قیژ وەسەر پەنجەرەکە کەوت.

خۆرەتاو بەرزتر ببۆوە. تەم رەویبۆوە. تیرەگە بەڵایەکان ئیتر نەدەبینران و رووناکییەکی سووریاو هەموو لایەکی دەنگاوت. ئەو کوتە تەختانەی دزیبوویانن لە سۆبەکەیان هاویشتن و ئاگریان دا. تینی ئەو تەختانە شتێکی دیکە بوو.

شۆخۆف گوتی: «خۆری مانگی ژانویە سەلکە تووریک ناهێنێ.»

کیلگاس لێکدەری چیمەنتۆکەی لەبەر یەک نایەوە. دوا چەکوچیشی لێداو بە دەنگی بەرز گوتی: «گوێ بگرە، پاڤلۆ، ئەو کارە بۆ دەستەی سەد و چوار سەد رووبڵی تێدەچێ. رووبڵێکی کەم بێ نامەوێ.»

پاڤلۆ پێکەنی و گوتی: «ئەگەر بەختت یار بێ جیرەکەت کەمێک چەورتر دەبێ».

گۆپچیک لەو سەرەوە گوتی: «باقیەکەشی لە دادگا دەتدەنێ.»

شۆخۆف نەڕاندی: «دەست راگرە، دەست راگرە.» (خەریک بوون لبادەکە خوار ببڕن.) پێی گوتن چۆناوچۆنی ببڕن.

چەند کەس لە سۆبەکەی تر هاڵابوون، بەڵام پاڤلۆ بڵاوەی پێکردن. هێندێکی دار دایە کیلگاس تا زەنبەڵێکی پێ دروست بکا بۆ ئەوەی چیمەنتۆی پێ وەسەر بخەن. دوو کەسی نارد زیخ بێنن. یەکی نارد بەفری سەر داربەست و دیوارەکان بماڵێ و یەکێکی تریشی راسپارد زیخی گەرم لە سەر سۆبەکەوە بۆ لێکدەرەکە بیا.

دەنگی ماشێن لە دەرێ هات. لۆرییەک، خشتی هێنابوو. پاڤلۆ دەرپەڕییە دەرێ و بە راوەشاندنی دەست شوێنی رۆکردنی خشتەکانی پێ نیشان دا.

زیوالّی لبادەکانیان لە کەلێنی پەنجەرەکان ئاخنی، بەلاّم کوا بەری سەرما دەگیرا؟ وەک پەنجەرەکانیان بە پەڕە کاغەز گرتبێ وابوو، بەلاّم لە هیچ باشتر بوو. نێو ژوورەکە تاریک داهات و پێدەچوو بلێسەی ئاوری سۆبەکە رووناکایی پتر بووبێ. ئالیۆشا زوخالّی هێنا. یەکێک هاواری کرد: «لە سۆبەیان باوێ!» و یەکێکی دی بە دەنگی بەرز گوتی: «نا، دار تینی پترە!» ئالیۆشا سەری لێشێوابوو و لە جێی خۆی رەق راوەستابوو.

فتیۆکۆف لە پەنا سۆبەکە هەلّترووشکا. ئەو گەوجە چەکمەکانی راست بردنە سەر گڕەمەشخەلانی ئاگرەکە. گەمیەوان پشت ئەستۆی گرت و رایکێشایە لای زەنبەلّەکان: «وەرە زیخ بێنە، مارزباب!»

گەمیەوان پێی وابوو کاری ئۆردووگاش وەک خزمەت کردن لە هێزی دەریاییدایە. (هەر دەستووریکی درابا بێ ئەملاو ئەولا دەبوو بەرێوە بچێ!» مانگی پشوو بە جارێک لاواز ببوو، بەلاّم هێشتا توانای کاری هەبوو.

سەرەنجام هەرسێک پەنجەرەیان بە لباد گرتن. ئێستا تەنیا بە دەرگادا رووناکی دەهاتە ژوورێ. سەرماش هەر لەوێوە خۆی بە ژووردا دەکرد. پاڤلۆ گوتی سەرەوەی دەرگاکە بە لباد بگرن، تەنیا بەشی هاتوچۆ لەلای خوارەوەی بێلّنەوە. ئەوێشیان گرت کە پێیدا تێپەڕ دەبووی دەبوا سەرت نەوی کردبا.

سێ لۆری خشتە رۆکران. ئێستا کاری زەحمەت، تەنیا سەرخستنی ئەو خشتانە بوو بۆ نهۆمی دووەم.

پاڤلۆ گوتی: «دەگەلّ ئێوەمە وەستاینە! بابچین چاو لەسەرەوە بکەین.»

بەننایی پیشەیەکی وابوو ویقاری بە مرۆ دەبەخشی. شۆخۆف و کیلگاس وەدوای پاڤلۆ کەوتن. پلیکانەکە هەر خۆی تەسک و ترووسک بوو، سێنکا داری تەنیشتەکانیشی لێکردبوونەوە. دەبوو کاتی سەرکەوتن و هاتنەوە خوار توند خۆت بە دیوارەوە بنووسێنی، دەنا بێگومان هەلّدەدێرای. لەوە خراپتر ئەوە بوو سەرپلیکانەکان یەک تەختە سەهۆلّ بوو و پیاو پێی لەسەر گیر نەدەبوون. ئەدی چیمەنتۆیان چۆن وە سەر خستبا؟



چاوێکیان بەو دیوارانەدا گێڕا کە دەبوو دایانبنێن. بەفری سەر دیوارەکانیان ماشتبوون. هەر لەوێوە دەبوو دەست پێبکەن. دەبوایە بە تەشوێ سەهۆلّی کەرپووچەکان بتاشن و لێیان بکەنەوە. بۆ سەرخستنی کەرپووچ بیرێکیان بە مێشکیدا هات. لەباتی ئەوەی بە پلیکاناندا وە سەری بخەن، وا چاک بوو چوار کەسان لە خوارێ دانێن کە خشتەکان هەلاّوێنە سەر داربەستی یەکەم. لە وێشەوە دووکەس هەلّیانهاوێنە نهۆمی دووەم. دوو کەسیش بیانکێشنەوە نزیک دیوارەکان. ئەمە خێراترین رێگای سەرخستنی کەرپووچ بوو.

لەو سەرە بایەکی توندی نەدەهات. بەلاّم تەزوویەکی ساردی دەهات کە لە کاتی کارکردندا لەشی مرۆی دەسمی. بۆ گەرم بوونەوە دەبوو خۆ لە پەنا دیوارەکان بگرن.

شۆخۆف سەیرێکی ئاسمانی کرد و هەناسەی دەردا. بەپێی بەرز بوونەوەی خۆر، نیوەڕۆ نزیک ببۆوە. کە سەرقالّی کارێک بایەی زەمان چەند تیژ تێدەپەڕی. رابردنی زەمان لە ئۆردووگادا هەمیشە مرۆی تووشی سەرسوڕمان دەکرد. تا چاوت لێکدەنا رۆژ و عەیام رادەبردن، بەلاّم سالّ تێوەرنەدەسووڕانەوە و رۆژی رزگاری پێدەچوو قەت نەیە.

هاتنەوە خوارێ. جگە لە گەمیەوان و فتیۆکۆف کە زیخیان دەکێشا، ئەوانی تر هەموویان لە دەوری سۆبەکە خڕ ببوونەوە. پاڤلۆ لێیان تووڕە بوو و هەشت کەسی لێناردنە کن خشتان، دووی ناردن چیمەنتۆ و زیخ لە لێکدەرەکە بکەن و، دوو کەسی دیکەشی وەدوای ئاو و رەژی خستن.

کیلگاس بە وانەی کاریان لەگەلّ دەکرد، گوتی:

«زووکەن دەی، با کاری ئەو زەنبەلاّنە لەکۆلّ کەینەوە.»

شۆخۆف بە پاڤلۆی گوت: «وا باشە منیش یارمەتییان بدەم.» پاڤلۆ سەری لەقاندو گوتی: «قەیدی نییە.»

بەرمیلێکیان بۆ تواندنەوەی بەفر هێنا. یەکێک گوتی: «نیوەڕۆیە!»

شۆخۆف گوتی: «نیوەڕۆ بووە، خۆر گەیشتۆتە سەر تەپلّی سەرمان.»

دەنگی گەمیەوان دەهات کە دەیگوت: «ئەگەر وابێ سەعات یەکی پاش نیوەڕۆیە، نەک دوازدە.»

شۆخۆف پرسی: «چۆن؟ لە هەر ریش سپـییـەک بپرسی دەزانێ خۆر نیـوەڕۆیان دەگاتە کوێ.»

گەمیەوان بە سەریدا قیڕاند: «ئەو قسەیە هی سەردەمی هەمان ریش سپییانە. ئێستا یاسایەکیان داناوە خۆر کە گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمان کات دەبێتە پاش نیوەڕۆ.»

«کێ ئەو یاسایەی دارشتووە؟»

«حکومەتی شۆراکان!»

گەمیەوان بە خۆ و زەنبەڵەوە دەرکەوت. شۆخۆف تاقەتی شەڕەچەقەی نەبوو. چۆن وایە؟ یانی سووڕانی خۆریش بە دەست ئەوانە؟

سەرەنجام تەق و هۆڕی چەکوچەکە بڕایەوە و چوار زەنبەڵ بۆ کێشانی چیمەنتۆ ئامادە کران.

پاڤلۆ گوتی: «زۆر باشە، ئێستا لەبەر سۆبە دانیشن و خۆتان گەرم بکەنەوە... سێنکا تۆش دەبێ دوای فراڤین دیوار دابنێی. ئێستا خۆت گەرم بکەوە.

ئینجا دەیانتوانی بە خەیاڵی ئاسوودەوە بە دیار سۆبەوە دانیشن. پێش فراڤین نەیاندەتوانی هیچ کارێک بکەن. ئەگەر چیمەنتۆیان گرتباوە، تا ئەودەم دەیبەست.

ڕەژیی نێو سۆبەکە جوان گەشابوونەوە و گەرمایەکی خۆشیان بڵاو دەکردەوە. بەڵام دەبوو چووبایە پەنای، دەنا گەرم نەدەبوویەوە. جێیەکانی دیکەی ژوورەکە هێشتا سارد و سڕ بوون.

هەر چواریان دەستکێشیان لە دەست دەرێنابوون و دەستیان بۆ تینی سۆبەکە رادەداشتن.

نەدەبوو چەکمەکانت تخوونی ئاگر بخەی. ئەگەر چەکمەی ئاسایی بان قایشەکەیان دەقەڵشی و چەکمەی لبادیش دەخووسان، هەڵمیان دەکرد و پێیەکانت پتر رەق هەڵدەهاتن. ئەگەر بە ئاگریشت راداشتبان دەسووتان، ئەوجا ناچار بووی هەموو زستان بە چەکمەی دڕاو بەسەر ببەی. تازە تا بەهارێ چەکمەی نوێیان نەدەدایەی.

کیلگاس گاڵتەی بە شۆخۆف دەکرد؛ گوتی: «شۆخۆف بۆ دەبێ نیگەران بێ؟ لەو رۆژانەدا بەردەبێ، پێیەکی لە دەرێیە.»

یەکێ لە زیندانییەکان گوتی: «ئادی، هەها پێیەکی لە چەکمە دەرێناوە.»



هەموو پێکەنین. (شۆخۆف چەکمەی پێی چەپەی داکەندبوو- ئەوی کونەکە-و پێپێچەکانی گەرم دەکردنەوە.)

«خەریکە بەر دەبێ!»

بیست و پێنج ساڵیان بۆ کیلگاس بڕیبۆوە. کۆنە زیندانییەکان بە بەختتر بوون، چونکە زۆربەیان دە ساڵیان دابوونێ. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٩وە هەر کەس گرتبوویان بێ ئەملاو لا بیست و پێنج ساڵیان دابۆیە.

رەنگبوو پیاو دە ساڵ خۆی رابگرێ و نەمرێ، بەڵام پاش بیست و پێنج ساڵ چی بە بەرەوە دەما؟

شۆخۆف لەبەر ئەوەی هەموویان وەکو پیاوێکی خۆشبەخت سەیریان دەکرد کە ماوەی حەپسەکەی خەریکە تەواو دەبێ، لەدڵەوە کەیفی دەکرد، بەڵام باوەڕی نەدەکرد رۆژێک لە رۆژان ئازاد ببێ. هێندێک زیندانی کە بڕیار وابوو لە کاتی شەڕدا ئازد کرێن، بەڵام تا «راگەیاندراوێکی تر» لە زیندانیاندا راگرتن، ساڵی چل و شەش بەریان دان. هێندێکیان سێ ساڵیان کێشابوو، پێنج ساڵی دیکەشیان بۆ خستنە بان. یاسا لە نێو دەستی کاربەدەستاندا وەک مێو نەرم بوو. کە دە ساڵت دەکێشا دە ساڵی دیکەیان داویشتە سەر، دەنا نەیاندەهێشت بگەڕێیەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆت.

هەندێ جاریش پیاو هەستێکی سەیر دایدەگرت. لە دڵی خۆتدا دەتگوت رۆژێکی بەخت رووت تێدەکا، جا ئەودەم، خوایە، بیری لێ بکەوە، پیاو بتوانێ لێرە بچێتە دەرێ و بگەڕێتەوە ماڵ و حاڵی خۆی!

بەڵام زیندانیی بە ئەزموون قەت ئەو خەونەی نەدەهێنایە سەر زمان. شۆخۆف بە کیلگاسی گوت: «گوێ مەدە ئەو بیست وپێنج ساڵەی بۆیان بڕیوبەوە، تا ئەودەم هەزار کڵاو بە بایەک؟ من هەشت ساڵی تەواوم کێشاوە، لەوەدا گومانم نییە.»

بەم جۆرە رۆژ یەک لە دووی یەک دەهاتن و رادەبردن و تۆ داماو و دەستەوئەژنۆ، قەت ئەو دەرفەتەت بۆ نەدەڕەخسا بیری لێبکەیەوە کە بۆ تووشی ئێرە بووی و کەی رزگاریت دێ؟

***

له دۆسییەکەیدا تاوانەکەی دیار بوو. خۆی دانی پێدانابوو کە خیانەتی کردووە و خۆی بەدەست دوژمنەوە داوە. بە پێی ئەو فەرمانەی ئەڵمانییەکان پێیان دابوو، گەڕابۆوە نیشتمان، بەڵام ئاخۆ ئەڵمانییەکان چ فەرمانێکیان پێدابوو، ئەوە نە بۆخۆی دەیزانی و نە لێکۆڵەرەکەی. بەڵام ئەوان ئەوەندەیان بەس بوو و، بە تاوانی دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ دوژمن، گرتبوویان.

بە بڕوای شۆخۆف مەسەلەکە زۆر ساکار بوو. ئەگەر حوکمی دادگای ئیمزا نەکردبا، هەر لەوێ دەیانبەتلاند. بەڵام ئەگەر ئیمزای کردبا، ماوەیەکی دیکەش دەژیا. کەوابوو ئیمزای کرد.

ڕووداوەکە، بەو جۆرە بوو: لە مانگی فیوریەی ساڵی چل و دوو لە بەرەکانی شەڕی باکووری ڕۆژئاوادا سوپاکەیان کەوتە نێو ئابلۆقەی دوژمنەوە. لە ڕێگای هەواوە خواردنیان بۆ نەدەهات. باسی چ فڕۆکان لە گۆڕێدا نەبوو. کەوتبوونە بارودۆخێکی واوە سمی ئەسپی تۆپیویان دەهاڕی، دەیانخووساندو دەیانخوارد. فیشەک و تەقەمەنیشیان پێنەمابوو. چەند تاقمێکیان لە جەنگەڵ کەوتنە بەر دەستی ئەڵمانییەکان کە شۆخۆفیش لەگەڵ یەک لەو تاقمانەدا بوو. یەک دوو ڕۆژی لە نێو قەفەزی دیلی شەڕی ئەڵمانییەکاندا بەسەر برد، ئینجا لەگەڵ چوارکەسی دی ڕایانکرد. بە لێڕەواردا و دوای تێپەڕین لە گۆلاوان، توانیان خۆ بگەیەننەوە سنووری سوپاکەی خۆیان. کە گەیشتنە وێ ڕەشاشچی وەبەر دەسڕێژی دان. دوو کەسیان هەر لەوێ لێکوژرا و یەکی دیکەش بریندار بوو کە دوای ماوەیەک ئەویش تەواو بوو. تەنیا دووکەس دەرچوون. خۆزگە عەقڵیان وەکار خستباو گوتبایان لە لێڕەوار ڕێگایان لێگۆڕاوە. ئاوا هیچ بەڵایەکیان بەسەر نەدەهات. بەڵام ڕاستییەکەیان گوت کە لەبەر دەستی ئەڵمانییەکان هەڵاتوون. (لەبەر دەستی ئەڵمانییەکان هەڵاتوون؟ گووی دەخۆن، دایک حیزینە!) لەوانەیە ئەگەر هەموو مابان، بە بیستنی سەربوردەکە لە زمانی هەر پێنج کەسەوە بڕوایان پێکردبان. بەڵام دوو کەس، قسەیان نەدەچووە سەرێ. کاربەدەستان ئەرخەین بوون و پێشیان گوتن ئێوەی گەوادباب لەگەڵ ئەڵمانەکان کلکتان لێک هاڵاندووەو هەڵاتوون.

سێنکا کلێڤشین بە خۆی و ئەو گوێچکە کپ و کەڕانەیەوە گوێی دابوونێ و یەک بەخۆ گوتی: «من سێ جار هەڵاتم و هەرسێ جار گرتیانمەوە.»

سێنکا لە ئوردووگا کاژێکی هاویشتبوو. زۆری نەدەگوت. گوێی لەقسەی ئەوانی دی



نەدەبوو، زۆربەی دەمان کڕو بێدەنگ بوو. بۆیە کەس چی وای لە بارەیەوە نەدەزانی. هەر ئەوەندەیان دەزانی لە «بوخنوالدە» بووە و دەستی لە ئاژاوەیەکی چەکدارانەدا بووە. ئەڵمانییەکان قۆڵبەستی دەکەن، سەروبن هەڵیدەواسن و دارکاری دەکەن. کیلگاس گوتی: «ئیڤان ڕاستە تۆ هەشت ساڵت کێشاوە، بەڵام لە چ ئۆردووگایەکدا؟ زۆربەی ئەو ماوەیە لە ئۆردووگای ئاسایی بووی و ژنیشتان لەگەڵ بوونە. ژمارەتان پێوە نەبووە. بەڵام هەشت ساڵ لە ئۆردووگایەکی تایبەتدا، شتێکی ترە. کەس سەری زیندوو لێرە ناباتە دەر.»

«من لەوێ لە مووڕە داران بەدەر چم نەدی، ژنی چی و حاڵی چی؟»

لە ئاگرەکە ورد بۆوە و حەوت ساڵ ژیانی باکووری هاتەوە یاد. ئەو سێ ساڵەی بۆ سندووق و تراڤێرس داری جەنگەڵیان دەبڕین. شەوانە لەو ئۆردووگا جەنگەڵییەدا کاریان دەکرد. وەک ئێستا، لەبەر بڵێسەی ئاگر دادەنیشتن. بە پێی فەرمانی فەرماندەی ئۆردووگا، هەر دەستەیەکی کاری خۆی تەواو نەکردبا، دەبوو شەو لە لێرەکە بمێنێتەوەو کارەکەی تەواو بکا. ئەغڵەبە تا نیوەشەو لە جەنگەڵ دەمانەوەو بەیانی زوو، دیسان دەهاتنەوە جەنگەڵ.

شۆخۆف بەو تەرە تەرە پێکەنیناوییەوە گوتی: «نا.. دۆستان، وانییە... پێم لێرە ئاسوودەترین. سەری سەعاتی دیاریکراو دەست لە کار هەڵدەگرین، جا کارەکە تەواو بێ یان نا. جیرەی نانیشمان سەد گرام لە هی وێ زیاترە. لێرە پیاو لە برسان نامرێ. باهەر ناوی ئۆردووگای تایبەت بێ، ئەو ژمارانەتان بەسەر کۆڵەوە زۆر قورسن؟ بوون و نەبوونیان وەک یەک وایە.»

فتیۆکۆف بە ڕک هەستانەوە گوتی: «بەوە دەڵێی ژیانی ئاسوودە؟»

(کاتی فراڤین نزیک ببۆوەو هەموویان لە سۆبەکە ئاڵابوون.)

«لێرە، لەخەودا سەری مرۆ گۆشاوگۆش دەبڕن! ئەوە ژیانی ئاسوودەیە؟»

پاڤلۆ پەنجەی بردە سەر چاوی فتیۆکۆف، وەک بڵێی هوشداری پێ بدا و گوتی: «سەری مرۆ، نا، هی سیخوڕان!»

ئەوەیان بە ڕاستی شتێکی نوێ بوو. ڕۆژێک کە لەخەو هەستان، جەندەکی دوو سیخوڕیان بەسەری بڕاوەوە لە تەختەکانیاندا دۆزیبوونەوە. چەند ڕۆژ دواتر هەمان

کارەسات بەسەر زیندانییەکی بێتاوانیش هاتبوو. لەوانەیە شەو بە هەڵە چووبنە زگی. ئینجا سیخوڕی راستەقینە خۆی گەیاندبووە مەئموورانی زیندان و داوای لێکردبوون لە زیندان رای بگرن. هەر ئەوە مابوو! لەئۆردووگا ئاساییەکاندا شتی وا رووی نەدابوو. لێرەش ئەوە یەکەم جار بوو.

***

ماتۆڕی کارەبا فیکاندی. سەرەتا دەنگی گڕ بوو. دەتگوت خەریکە ئەوکی ساف دەکا، ئینجا یەک بەخۆ هاڕاندی.

رۆژیان بە نیوە کردبوو. کاتی فراڤین بوو.

پەکو چەند بە قۆنەقۆن بوون! دەبوو زووتر چووبانە خواردنگەو لە ناو ریزەکەدا جێی خۆیان کردبایەوە. پازدە دەستە لە کارگەی بیناسازیدا کاریان دەکردو خواردنگە هەر جێی دوو دەستە دەبۆوە.

تیۆرین هێشتا نەهاتبۆوە. پاڤلۆ چاوێکی لە دەوربەری کردو گوتی: «شۆخۆف و گۆپچیک، لەگەڵ من وەرن. کیلگاس، کە گۆپچیک هاتەوە، هەمووان لەگەڵ خۆت بێنە!» کەسانی دی جێگاکانیان لەدەوری سۆبەکە گرتنەوە. دەتگوت سۆبە ژنێکە و هەموو دەیانەوێ لە ئامێزی گرن.

یەکێک هەرای کرد: «بەسە! کاتی جغارەکێشانە!»

هەموویان لێکتریان روانی تا بزانن کێ جغارە پێدەکا. بەڵام کەس جغارەی پێنەکرد، کەس تووتنی پێنەبوو، یەکێکیش هەیبا حەزی نەدەکرد لەبەرچاوی هەمووان دای بگیرسێنێ.

شۆخۆف و پاڤلۆ وەدەرکەوتن و گۆپچیکیش بە غاردان وەدوویان کەوت. لەدەرێ شۆخۆف گوتی: «هەوا کەمێک خۆشتر بووە، نابێ لەهەژدە پلە پتر بێ. بۆ کارکردن دەناڵێ!»

چاوێکیان لە خشتەکان کرد. خشتێکی زۆر لەسەر داربەستی سەرەوە دەبینراو هەندێکیش برابووە قاتی دووەم. شۆخۆف لە خۆرەتاوی روانی و قسەی گەمیەوانی وەبیر هاتەوە.

لە دەرێ، لە هەوای ئازاد دا، با یەکسەر لە دەموچاوی دەدای و بیری دەخستیەوە مانگی ژانویەیە.

***



خواردنگە زاخەیەکی لە دار دروست کراو بوو. سۆبەیەکیان لە نێوەڕاستی دانابوو. درزی ساپیتەو دیوارەکانیان بە پارچە تەنەکەی ژەنگاوی گرتبوون. نێو زاخەکە دەبووە دوو بەشی چێشتخانە و خواردنگە. عەرزی هەر دوو بەشەکە گڵ و خۆڵ بوو و بە هاتوچۆ قووڵک قووڵک ببوو. ئەو بەشەی پێیان دەگوت چێشتخانە، تەنیا ئاورگێکی چوار گۆشەی تێدابوو کە مەنجەڵێکیان لێ وەسەر دەنا.

دوو کەس خواردنگەیان بەڕێوە دەبرد، ئاشپەز و موفەتیشی تەندروستی. هەموو رۆژێ بەیانان کە لە ئۆردووگا وەدەر دەکەوتن ئاشپەز هێندێکی گەنمە کوتاو لە چێشتخانەی گەورە وەردەگرت. بەشی هەر زیندانییەک نزیکەی پەنجا گرام بوو.

هی هەر دەستەیەک دەیکردە کیلۆیەک و بۆ هەموو ئەوانەی دەهاتنە کارگای بیناسازی کەمێ لە پووتێک کەمتر بوو. ئاشپەز خۆی زەحمەتی هەڵگرتنی توورەکەی گەنمە کوتاوەکەی لە ئۆردووگاوە تا کارگا وەبەر خۆی نەدەدا. بۆ ئەو کارە «پیاو»ی هەبوو. بەشە خواردنێکی چەورو چۆڵتری دەدایە، دیارە لە دەمی زیندانییەکانی دیکەی دەگرتەوە.

بۆ لە ژێر ئەو کۆڵە گرانەدا پشتی خۆی بشکێنێ؟ هێنانی ئاو و ئاوردوو و هەڵکردنی ئاگردانیش، ئاشپەز نەیدەکردن. بۆ ئەو کارانەش «پیاو»ی هەبوون و ئەوانیش خۆراکی پتریان وەردەگرت. ئاشپەز چ پەکی پێدەکەوت؟

بە پێی یاسا، زیندانی دەبوو خۆراکەکەی هەر لەناو ئەو زاخەیەدا بخوا. بەڵام ناچار بوون هەموو رۆژێ قاپەکانیان لە ئۆردووگارا لەگەڵ خۆیان بێننە کارگا. (ئەگەر شەو قاپەکانیان لەوێ جێ هێشتبان کرێکارانی ئازاد دەیاندزین.) هەموو جارێ کە پەنجا کەس نانیان دەخوارد، زوو قاپەکانیان دەشۆردنەوەو بۆ پەنجا کەسی دیکەیان ئامادە دەکردن. (ئەو کەسەی قاپەکانیشی دەبردنەوە چێشتخانە خۆراکی زیادەی وەردەگرت.)

پیاوێکی دیکەشیان لەبەر دەرکە دانابوو، تا نەیەڵێ کەس قاپان لە خواردنگە بباتە دەرێ، بەڵام قاپ هەر دەبرانە دەرێ. زیندانییەکان یاساوڵەکەیان دەخافڵاند، یان جاری وابوو کە لە فکر رادەچوو، گورزی خۆیان دەوەشاند. پیاوێکی دیکەش دەبوو لە قاپە نەشۆراوەکان بگەڕێ و بیانباتەوە چێشتخانە. ئەو دوو کەسەش خواردنی پتریان وەردەگرت.

کاری ئاشپەز هەر ئەوەندە بوو گەنمەکوتاوو خوێ لە مەنجەڵەکە بکاو ئەگەر دووگیش هەبا لەنێوان خۆی و مەنجەڵەکەی دابەش بکا. ببڕای ببڕ دووگی چاکی لە شێوەکە نەدەکرد، کەواتە هەر وا چاک بوو دووگی بۆیا گرتووی عەمباری بدەنێ و ئەویش بە ناچاری دە چێشتەکەی بکا!) کارێکی تری ئاشپەز ئەوە بوو، کە مەنجەڵەکە وەکوڵ دەهات ئەسکۆیییەکی تێوەر بدا. موفەتیشی تەندروستی لە ئاشپەزیش بێکارتر بوو. دادەنیشت و سەرنجی ئاشپەزی دەدا، کە چێشتەکە دەکوڵی، پێکەوە تا زگیان دێشا، دەیانخوارد. ئینجا سەردەستەیەک – هەر ڕۆژەی نۆرەی یەکێکیان بوو– دەهاتە چێشتخانەو چێشتەکەی خوێچێژ دەکرد تا بزانێ دەخورێ یان نا. ئەویش دوو بەرامبەری خۆراک وەردەگرت.

دوای هەموو ئەوانە فیکەیان لێدەدا. ئینجا سەردەستەکان دەهاتن و ئاشپەز لە کونێکی وەک دەلاقەوە خۆراکەکەی دەدانێ. هەر قاپەو یەک دوو ئەسکوێی شلکێنەی شل تێدەکرد و نەدەبوو کەس ورتەی لێوە بێ. گوتبات لەل خاکەسار دەبووی.

با، لەو پێدەشتەدا دەیگڤاند. ئەو بایە هاوینان وشک و گەرم بوو و زستانانیش سەرمای چەندین فرسەخ بەفرو سەهۆڵی لەگەڵ خۆی دێنا. ئەو قاقرە هیچ گیایەکی لێ نەدەڕوا، تەنانەت لەو شوێنانەی تێلبەندیشیان لێ نەبوو.

نان بەدەست دابەشکەرانەوە بوو و جۆش تەنیا لە عەمبارەکانی ئۆردووگا هەبوو. هەرچەندی خۆت پساندبا، لەوەندووکە نانە دیاریکراوە نەمر نەژییە زیاتر، گورچووی نەدەگرتی. ئەو پارووە نانەش لە سایەی ئاشپەز و شلەو قولەکانییەوە بە تەواوی نەدەگەیشتە دەستت. لە سەرەوە تا خوارێ هەموویان دز بوون . لێرە لە کارگای بیناسازی و لەوێ لە ئۆردووگا و لە عەمبارەکانیش... ئەو دزانە قەت دەستیان لە ڕەش و سپی نەدەدا. تا دەپسای دەبوو کار بکەی، بەڵام نانەکە ئەوان دەیاندا، چیان دابا هەر ئەوە بوو.

پاڤلۆ و شۆخۆف و گۆپچیک چوونە خواردنگە. دەرزیت هەڵدابا بەر زەوی نەدەکەوت. مێزو نیمکەتی بەتاڵ دەست نەدەکەوتن. هێندێک زیندانی دانیشتبوون هەندێکیش بە پێوە بوون. دەستەی بیست و شەش کە لە بەیانییەوە لە دەرێ خەریکی قووڵکە هەڵکەندن بوون، کە فیکەیان گوێ لێبوو، پێش هەمووان هاتبوونە خواردنگە و جێگاکانیان گرتبوونەوە. نانیان خواردبوو، کەچی وەدەر نەدەکەوتن. دڵیان لەو شوێنە گەرمە بەر نەدەبوو. وەک بارێزە جنێویان بەسەردا دەباری، بەڵام پەکیان پێنەدەکەوت. چ گوێیان لێبوو؟ خۆ لەوە ناخۆشتر نەبوو بەو سەرمایە لە دەرێ بن.



پاڤلۆ و شۆخۆف دڕیان بە خەڵکەکە دا. جەنگەیەکی باش گەیشتبوونێ. دەستەیەک خەریکی وەرگرتنی چێشت بوون و دەستەیەکیش لە پشت دەلاقەکە چاوەڕوان بوون. یاریدەدەرەکانیش لەوێ بوون، کەوابوو دوای ئەو دەستەیە نۆرەیان بوو.

ئاشپەز لەودیو دەلاقەکەوە هاواری کرد: «قاپ! قاپ!»و لەم دیوەی دەلاقەڕا قاپەکانیان وەدەستی دان. شۆخۆف نەک بۆ بەشەخۆراکی زیاتر، بەڵکو بۆ ڕاپەڕاندنی خێراتری کارەکە چەند قاپی هەڵگرتن و لە دەلاقەی ئاودیو کردن. لە چێشتخانە یەک دوو کەس لە «پیاو»انی ئاشپەز خەریکی قاپشۆردن بوون. ئەوانیش بە خۆڕایی ئەو کارەیان نەدەکرد.

ئەو یاریدەدەرەی لە پێش پاڤلۆ بوو خواردنی بۆ ئەفرادی خۆی وەرگرت و پاڤلۆ بەسەر خەڵکەکەوە هەرای کرد:

«گۆپچیک»

دەنگی تیژی گۆپچیک لە پشت دەرگەوە هات کە بەرسڤی دایەوە: «من لێرەم.» دەتگوت بزنە دەبارێنێ. «بانگیان کە.»

گۆپچیک غاری دا.

سووپی ئەوێ ڕۆژێ خراپ نەبوو. چاکترین شێو بوو کە بە جۆی دووسەریان لێدەنا. هەمیشە وا هەڵنەدەکەوت. ئەغڵەب ڕۆژێ دووجار «ماگارا» یان شلکێنەیان لە ورگی دەکرد. جۆیەکە باش بوو بەری دڵی پیاوی دەگرت.

شۆخۆف بە لاوی چەندی جۆی وا دابووە ئەسپ! ئەوان دەمان هەرگیز بەخەیاڵیشیدا نەدەهات ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆی ئاتاجی لوێچێک لەو جۆبە بێ! لە پشت دەلاقەوە هەرایان دەکرد: «قاپ! قاپ!»

نۆرەی دەستەی سەدوچوار هات. ئەو یاریدەدەرەی لە پەنایان بوو، بەشە خۆراکی دووقاتی خۆی وەرگرت و ڕۆیی. ئەو بەشە زیادیانەیان هەموو لە دەمی ئەوان دەگێڕایەوە. بەڵام کەس مەتەقی نەدەکرد. هەموو سەردەستەکان دەیانتوانی بەشی دووقات وەرگرن، جا یان بۆ خۆیان یا بۆ یاریدەدەریان. تیۆرین خواردنە زیادەکەی خۆی دەدایە پاڤلۆ.

شۆخۆف چوو هەتا ئەو دوو مردەلۆخەیە هەستێنێ کە لە پشت مێزێک پان ببوونەوە.

داوای لە زیندانییەکی تر کرد، ئینسافی هەبێ جێگاکەیان بۆ چۆڵ بکا. لەسەر مێزەکە جێی بیست قاپی کردەوە. (سەرەتا دەبوو دوازدە قاپ لە پەنا یەکتر دابنێ، شەش دانەی دی لەسەر ئەوان دابنێ و دوو قاپی تریش دانێتە سەر شەش قاپەکان) ئینجا دەبوایە قاپەکان لە پاڤلۆ وەربگرێ. بیانژمێرێ و چاو لە مێزەکە هەڵنەگرێ، نەکا بیاندزن یان بیانرێژن. زیندانییەکان بە هەموو لایەکدا دەهاتن و دەچوون و دادەنیشتنە سەر مێزەکان، یان هەڵدەستان.

ئاشپەز لەودیوڕا قاپەکانی دەژماردن: «دوو! چوار! شەش! قاپەکانی دوو دوو وەدەستی شۆخۆفی دەدان و ئەویش لەسەر مێزەکەی دادەنان. شۆخۆف بەدەنگ نەیدەژماردن، بەڵام لە هەموو کەس زیاتری هۆش لەسەر بوون.

«هەشت، دە.»

گۆپچیک و وان بۆ تا ئێستا نەهاتوون؟

«دوازدە، چاردە.»

قاپی چێشتخانە تەواو بوون. شۆخۆف بەسەر سەرو شانی پاڤلۆدا چێشتخانەکەی دەدی. دوو قاپ لەسەر دەلاقەکە دەبینران کە ئاشپەزەکە توند گرتبوونی. پێدەچوو لە فکر راچووبێ. دەبوو ئاوڕ بداتەوەو بەسەر قاپشۆرەکاندا بقیژێنێ. بەڵام راست لەو دەمەدا کۆمایەکیان قاپ لەم دیوەی دەلاقەڕا وە سەر گێڕا. ئاشپەز دەستی لە قاپەکان بەرداو قاپە بەتاڵەکانی بردنە ناو چێشتخانەوە.

شۆخۆف دوو قاپی لە قاپە شێوی سەرمێزەکە هەڵگرت. لاقێکی بەسەر ئەو کورسییەدا هەڵێنایەوە کە سەر رێی لێ گرتبوو، دوو قاپەکەی لەسەر دەلاقەکە هەڵگرتن و بەهێمنی، بەشێوەیەک کە هەر پاڤلۆ گوێی لێبێ، گوتی:

«چوارده دانە!»

ئاشپەز نەڕاندی: «هۆی! ئەو قاپانە بۆ کوێ دەبەی؟»

پاڤلۆ وەڵامی دایەوە: «هی ئێمەن! هی دەستەی ئێمەن!»

«ناڵێم هی ئێوە نین، بەڵام من حیسابەکەم لێ تێکدەچێ.»



پاڤلۆ گوتی: «چاردەن ئیدی» ئینجا شانی هەڵتەکاندن. پاڤلۆ یاریدەدەری دەستە بوو و نەیدەویست خۆی تووشی ئەو گێچەڵانە بکا، بەڵام ئاگاشی لە شۆخۆف بوو و هیچ نەبێ دەیتوانی بڵێ شۆخۆف بە هەڵە چووە.

ئاشپەز دەرهەڵبوو: «من چاردەم ژماردن.»

شۆخۆف بەقەو گوتی: «ژماردتن، بەڵام دوو دانەی دوایەت نەدانە ئێمە، دەستت لەسەر دانابوون! ئەگەر باوەڕ ناکەی وەرە ئەودیوە، خۆت بیانژمێرە. هەموو ئەوەتان!» هەروا کە لەگەڵ ئاشپەز مشتومڕی بوو، چاوی بە دوو ئوستوونییەکان کەوت و دوو قاپە زیادەکانی وێ دان. ئینجا گەڕایەوە جێی خۆی و بۆ دڵنیایی قاپەکانی سەر مێزی ژماردنەوە. ئەوانەی لە دەورو پشتیان بوون هەرچەند دەرفەتیان هەبوو، بەڵام هیچیان نەدزیبوو. ئاشپەز دەموچاوی سوور هەڵگەڕاو و دزێوی خۆی لە دەلاقەکەوە هێنا دەرێ.

«کوا قاپەکان؟» دەهری ببوو.

شۆخۆف قیژاندی: «فەرموو، ئەوەتان!» زیندانییەکی پاڵ پێوەناو گوتی: «لاکەوە! با زەریف بیانبینێ... ئەوە دوو!» قاپەکانی سەرەوەی هەڵگرتن. «ئەوەش سێ جار چوار، کە لەسەریەک دەبێتە دوازدە دانە. خۆت بیانژمێرە!» ئاشپەز چاوی بە سەرتاپایدا گێڕا و گوتی: «ئەدی کوان ئەفرادی دەستەکەتان؟»

دەلاقەکەیان تەسک کردبۆوە تا کەس ناو مەنجەڵەکە نەبینێ.

پاڤلۆ سەری راوەشاندو گوتی: «هێشتا نەهاتوون.»

ئاشپەز لە داخان دەستی سەگی دەگەست. گوتی: «ئەدی سندانت لە تەپڵی سەری دا، ئەو قاپانەت بۆ وەرگرتوون؟

شۆخۆف هاواری کرد: «ئەوەتا، هاتن.»

هەموو گوێیان لە دەنگی گەمیەوان بوو کە لە نێو دەرگاوە نەڕاندی: «بۆ وا داتانکوتاوە؟ نانی خۆتان خواردووەو وەدەرکەون! مراعاتی خەڵکیش بکەن!» دەتگوت لە سەر عەرشەی گەمیە راوەستاوەو فەرمان بە ئەفرادی بەردەستی دەدا.

ئاشپەز بە بۆڵەبۆڵ سەری بردەوە ژوورێ، ئێستا تەنیا دەستەکانی بە دەلاقەکەدا دیاربوون.

«شازده، هەژدە.»

ئینجا دوا قاپیشی بە ئەسکوێ پڕ کرد، دووی تێکردن.

«بیست و سێ، تەواو، دەستەی دواتر!»

ئەفراد بەناو ئەو قەرەباڵغییەدا دەهاتنە پێشێ و پاڤلۆ قاپی وەدەستی دەدان. هێندێکیان دەچوونە سەر مێزێکی دیکەو ناچار دەبوایە بەسەر خەڵکەکەدا قاپیان وێ بدا.

هاوینان پێنج کەس لەسەر نیمکەتێک دادەنیشتن، بەڵام ئێستا بەو هەموو جلوبەرگەوە، بە نەقەنەق بە چواران لەسەر نیمکەتێک جێیان دەبۆوە. پیاو بە باشی دەست و کەوچکی نەدەگەیشتە قاپی سەر مێزەکە. شۆخۆف بە تەمای ئەوەی لەو دوو قاپەی پاشقولی دابوون، یەکیانی بەردەکەوێ، بە پەلە ملی دەبەر خواردنی شێوەکەی نا. قاچی راستەی هەڵێنا. کەوچکێکی لە ملی چەکمەکە دەرهێنا کە نیشانەی «ئوست-ئیژما ١٩٤٢»ی لەسەر بوو. تەپلەکەی داگرت، دەبن هەنگڵی ناو کەوچکێکی لەچێشتەکە وەردا.

ئێستا دەبوو بە خەیاڵی ئاسوودەوە شێوەکەی بخوا. دەبوو خرت و پرتی نیشتووی نێو قاپەکە بە کەوچک هەڵگرێ، بە شێنەیی بۆ زاری بباو بە تام و چێژەوە بیجوێ، بەڵام بۆ ئەوەی پاڤلۆ قاپێکی دیکەی بداتێ دەبوو پەلە بکا، بۆیە بە تاڵووکە ئەو یەکەی هەڵقووڕاند. فتیۆکۆف کە لەگەڵ ئوستونییەکان هاتبووە خواردنگەو هەستی بە مەسەلەی قاپەکان کردبوو، سێسەرەی لە پاڤلۆ هەڵنەدەگرت و بەپێوە شێوەکەی دەخوارد. چاوی لێ هەڵنەدەگرتن. دەیویست بەشێوەیەک پاڤلۆ تێبگەیەنێ کە یەکێ لە قاپەکان و هەر نەبێ نیوەی قاپێکی بداتێ.

بەڵام ئەو کوڕە رەشتاڵە، پاڤلۆ، سەری بەسەر قاپە شێوەکەی خۆی رۆگرتبوو و ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەمابوو. وەک ئەوەی باسی خۆراکی زیادە هەر لە گۆڕێ نەبێ.

شۆخۆف قاپی یەکەمی تەواو کرد، رەنگە لەبەر ئەوەی چاوی لە قاپێکی تر بوو. وەک جاران بە قاپێک سووپی جۆ تێر نەدەبوو. ئەو لەتە نانەی دە پەرۆی وەرپێچابوو لە گیرفانی لاتەنیشتی دەرهێناو رە بنی قاپەکەی ئێخست. نانەکەی لستەوەو جارێکی دیکەشی رە بنی قاپەکە خشاند. قاپەکە، وەک شۆرابێ، پاکوخاوێن ببۆوە، بەڵام بریقەی نەدەدا. بەسەرشانی خۆیدا وە دەستی یەک لە قاپشۆرەکانی داو هەروا لەوێ خۆی مات کرد. هێشتا کڵاوەکەی لەسەر نەنابۆوە.



شۆخۆف ئەو دوو قاپەی قاچاندبوون، کەچی پاڤلۆ دەبوایە دابەشیان بکا. کەمێک راوەستا تا پاڤلۆ لە خواردنی چێشتەکەی بۆوە. پاڤلۆ قاپەکەی لێس نەدا. تەنیا کەوچکەکەی لستەوە. لە جێیەکی نێو جلەکانیدا شاردیەوەو خاچی کێشایەوە. ئینجا دەستی بۆ قاپەکان برد. سەرمێزەکە هەر جمەی دەهات. نەیدەتوانی بۆ لای شۆخۆفیان پاڵ بدا، بە جۆرێک کە وا نیشان بدا لە بەشی خۆی دەیداتێ، گوتی: «ئیڤان دنیسۆڤیچ، قاپێک بۆ خۆت و ئەوی دی بۆ سیزار بەرە.»

شۆخۆف وەبیری هاتەوە کە سیزار دەبێ خواردنی بۆ بچێتە نووسینگەی کارگا. (سیزار چ لێرەو چ لە ئۆردووگا پێی قاڕ بوو بچێتە خواردنگە.) شۆخۆف لەبیری بوو، بەڵام کە پاڤلۆ دەستی بۆ قاپەکان برد، بۆ ساتێک دڵی داخورپا کە نەکا هەردووک قاپانی بداتێ. بەڵام ئەوە خەیاڵپڵاو بوو.

دەمودەست ملی لە خواردنی ئەو خواردنە مفتەیە نا کە تازە هی خۆی بوو. ئەو زیندانییانەی تازە گەیشتبوونە خواردنگە هەرچەند لە پشتەوەڕا پاڵەپەستۆیان دەدا هەر تەقەی سەری نەدەهات. تەنیا نیگەرانی ئەوە بوو نەکا فتیۆکۆف دەست بەسەر قاپەکەی دیکەدا بگرێ. فتیۆکۆف کە جلغەی لە شتێک دەگێڕا وەک قیری کەوای سپی بوو. بەڵام بۆ خۆی قوونی وەی نەبوو شتێک بقاچێنێ.

گەمیەوان لە پەنایان دانیشتبوو. دەمێک بوو لە خواردنی شێوەکەی ببۆوەو ئاگای لە مەسەلەی خۆراکە زیادەکە نەبوو. چاوی بە دەوروبەری خۆشیدا نەدەگێڕا هەتا قاپەکانی پێش پاڤلۆ ببینێ. جێی خۆی خۆش کردبوو، نەیدەتوانی هەستێ و بەو ساردو سەرمایە بچێتەوە وێستگە.

ئێستا ئەویش جێگای خەڵکی داگیر کردبوو. راست وەک ئەوانەی پێنج دەققە لەمەوبەر بە هات و هاوار وەدەری نابوون. زۆر نەبوو لە ئۆردووگا دەژیا. هەرچەند بەخۆی نەدەزانی، بەڵام ساتی وا هەبوون، وەک ئێستا، کە لە ژیانیدا زۆر گرینگ بوون. لەو ساتانەدا بوو کە ئەفسەرێکی لووتبەرزی هێزی دەریایی بەو کەشوفشەیەوە دەبووە زیندانییەکی کۆڵەوارو بەستەزمان. بۆ ئەوەی دوای بیست و پێنج ساڵ، سەری ساغ لە ئۆردووگا بباتە دەرێ، دەبوو لەگەڵ ئەو وەزعە هەڵبکا.

زیندانییەکان دەسەریانەوە دەقیژاندو لە پشتەوەڕا پاڵیان پێوەدەنا هەستێ. پاڤلۆ گوتی:
«گەمیەوان! هۆ گەمیەوان!»

گەمیەوان ڕاچەنی. وەک لەخەو ڕاپەڕیبێ سەیری پاڤلۆی کرد. پاڤلۆ بێ ئەوەی پرسی پێبکا کە دەیەوێ یان نا، قاپە شێوەکەی وەپێش نا.

گەمیەوان بڕۆی هەڵکێشان. هێند بە وڕو هێڕی تەماشای قاپەکەی دەکرد دەتگوت بە عومری خۆی شتی وای نەدیوە.

پاڤلۆ بۆ ئەوەی دڵنیای بکا گوتی: «بخۆ! بخۆ!» و هەستا تا ئەو قاپەی مابوو بۆ سەردەستەی بیا.

بزەیەکی شەرمنانە نیشتە سەر لێوە بەبارەکانی گەمیەوان. پیاوێکی وا کە دەریای دەرواندەوری ئەوروپاو ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکووری بە پاپۆڕ بڕیبوو، ئێستا سەری بردبۆوە ناو قاپە شلکێنە جۆیەکی بێ تام و دەتگوت خوا خەنی کردووە.

فتیۆکۆف مۆڕەیەکی لە گەمیەوان و شۆخۆف کرد و دەرکەوت شۆخۆف ئەو کارەی پاڤلۆی بە دڵەوە نووسا. گەمیەوانیش بەرە بەرە لەگەڵ چەموخەمی کارەکان ڕادەهات، بەڵام تا ئەو کاتە دەبوایە بژی. ڕەنگبوو سیزاریش قاپە سووپەکەی بداتە گەمیەوان. بەڵام بۆ دەیداتێ؟ ئەوە دوو حەفتە بوو زەوادیان بۆ نەناردبوو.

شۆخۆف کە ئەو قاپە شێوەشی خوارد، چەند جار نانی ڕەقاپەکە ئێخست و هەموو جارێش نانەکەی دەلستەوە، ئینجا نانەکەشی خوارد. پاشان شێوە ساردوسڕەکەی سیزاری هەڵگرت و ڕۆیی.

لە نێو دەرگە کابرای ئەمینی قاپان پێشی پێگرت. شۆخۆف گوتی: «بۆ نووسینگەیە.»

نووسینگە کۆڵێتێکی لە دار دروستکراوی نزیک پاسەوانی بوو. لوولە سۆبەکەی، یەک بە ئەستووراییی خۆی دووکەڵی دەردەدا. لە بەری بەیانییەوە یەکبێن داییسا. چاودێری سۆبەکە، خزمەتکارێکی نووسینگە بوو کە ئەمری کاربەدەستانیشی بە سەردەستەکان ڕادەگەیاندو بۆ ئەوکارەش شتێکیان دەدایە. نووسینگە هەرگیز ئاوردووی لێ نەدەبڕا.

دەرگەی دەرێ بە جیڕە جیڕ کرایەوە. دەرگەیەکی دیکەش بوو کە بەتەلیس کەلێنەکانیان



گرتبوون. بە باقە هەڵمێکەوە وەژوور نووسینگەی کەوت. دەرگەی پێوەدایەوە. (زوو پێی وە نەدابایە هاواریان لێ هەڵدەستا: «هۆی، بیژوو، ئەو دەرگایە داخەوە.»

لە نووسینگە پیاو لە گەرمان دەپیشا. تیشکی خۆر کە لە پەنجەرە سەهۆڵاوییەکانەوە لە ژوورێی دەدا، مرۆی دەبووژاندەوە. خۆ وەک نەهۆمی سەرەوەی وێستگە نەبوو تیشکی خۆر چاو شەوارە بکا. ئاڵقەی دووکەڵی سەبیلەی سیزار وەک بخووری کڵێسایان، لەبەر تیشکی تاو بڵاو دەبوونەوە. سۆبەکە، تەنیشتەکانی وەک پەنگر سوور ببوونەوە. ئەو بیژبیانە پڕیان کردبوو لە قەڵاشکەری. لوولەکانیش سوور ببوونەوە و تینیان دەدا.

لەو جێگا گەرم و نەرمەدا پیاو هەر بە قوونەوە خەوی لێدەکەوت. نووسینگە دوو وەتاغ بوو. دەرگەی وەتاغی دووەم، هی سەرپەرشتیاری کارگە، ئاوەڵا بوو و لەوێڕا دەنگی دەهات کە دەیگوت: «ئێمە بۆ دانی مزە و کرێنی کەرستان لەگەڵ کەمیی دراو بەرەو ڕووین. زیندانییەکان لەبەر چاوی ئێوە ئەو تەختە گرانبایانە دەدزن، بێجگە لەو هەموو قالبەی دەیسووتێنن و خۆی لەبەر گەرم دەکەنەوە. چەند ڕۆژ لەمەوبەر، لەو ڕەشەبایەدا، زیندانییەکان لە کن عەمبار چیمەنتۆیان خاڵی دەکردو بە زەنبەلان دەیانکێشایەوە. لە دەورو پشتی عەمبار چیمەنتۆ تا گوێزینگان دەهات. ئەوانیش وەنێوی دەکەوتن و هەر گونیشیان پێ نەدەچوو. ئاگات لێبیە ئەو کەرستانە کوو خەسار دەکەن!»

دیار بوو سەرپەرشتیاری کارگە لەگەڵ سەرکارگەرەکاندا کۆ ببۆوە.

خزمەتکارێک لە کن دەرگا لەسەر کورسییەک پاڵی دابۆوە. زیندانیی ژمارە «ب-٢١٩، شکورۆ پاتنکۆ»ش لە پەنای، وەک دارتێلێک بەر پەنجەرەی گرتبوو و چاوی لە تەختە گرانباکان هەڵنەدەگرت.

ئەو گەوادە بێگومان وەختی لباد بردنەکە وێژینگی داون.

دوو کارمەندی نووسینگە هەردووکیان زیندانی بوون، لەسەر سۆبەکە نانیان برشتە دەکرد. بۆ ئەوەی نانەکە نەسووتێ، بەتێل شیشیان بۆ دروست کردبوو. سیزار لە پشت مێزەکەی پاڵی دابۆوەو سەبیلەی دەکێشا. پشتی لە شۆخۆف بوو و نەیدیبوو.

زیندانیی ژمارە «ک-١٢٣» بەرامبەری دانیشتبوو. پیاوێکی بەساڵداچووی ڕەقەڵەی هەر ئێسک و پێست، کە سی ساڵ بوو لە زیندان بوو. نانی دەخوارد.

سیزار دەیگوت: «تۆ هەڵەی هاواڵی بەڕێز، ئێمە ئەگەر کڵاوەکەی خۆمان بکەینە قازی ئایزنشتاین بلیمەتە. توخوا «ئیڤان مخۆف»ەکەی شاکار نییە؟ سەمای «ینی چری»یەکان بە دەمامکەوە، دیمەنی کڵێسەی گەورە!» هەوڵی دەدا لەو دەمەتەقێیەدا خاتری پیرەپیاوەکە بگرێ.

«ک- ١٢٣» بە تووڕەیی گوتی: «هەمەوو ئیدیعایە!» کەوچکەکەی بۆ دەمی بردبوو. درێژەی دایە: «هونەر نومایی لە رادەبەدەر، ئەوپەڕی بێهونەرییە. وەک ئەوە وایە هەرای فرۆتنی گەنم بکەی و جۆ بدەیە خەڵکی! ئەویش بەو تێڕوانینە سیاسییە قەباحەتەوە کە دەیەوێ جاشێتی مرۆڤێک پاساو بدا. ئەو فیلمە سووکایەتی کردن بە بیرەوەریی سێ وەچە لە رۆشنبیرانی رووسیایە!»

(شێوی دەخوارد، بەڵام دەتگوت قوزەڵقورت دەخواو لە ئەوکی ئاوا نەدەبوو.)

«دەی ئەگەر وای نەکردبا مۆڵەتی دروستکردنی فیلمەکەیان دەدایە...؟»

«هەو! مۆڵەت؟ ئەدی بۆ پێی دەڵێی بلیمەت؟ کابرایەک بووە نانی بە نرخی رۆژ خواردووە. هونەرمەندی رەسەن لەبەر دڵی خۆفرۆشان لە نرخی کارەکەی داناشکێنێ.»

شۆخۆف قوڕگی زاخاو دا: «ئحم م.» دەترسا ئاخاوتنی ئەو مرۆڤە خوێندەوارانە تێک بدا. لە سەرێکیشەوە خۆی پێ رانەدەگیرا.

سیزار لای کردەوەو دەستی بۆ قاپەکە راداشت. وەک ئەوەی بیەوێ هەر لە حەوا بیگرێ. بێ ئەوەی سەیری شۆخۆف بکا، درێژەی بە قسەکانی دا:

«تۆ گوێ بگرە! لە هونەردا «چی» گرینگ نییە، «چۆن» گرینگە.»

ک-١٢٣ هەڵبەزیەوە، مستەکۆڵەیەکی لە مێزەکەداو گوتی:

«نە ء ئەگەر نەتوانێ هەستێکی راستم تێدا بژێنێتەوە، سندان لە خۆی و لەو «چۆن»ەشی بدا!»

شۆخۆف قاپەکەی وە دەستی سیزار داو تا توانی چاوەنۆڕ مایەوە. چاوی لەوە بوو سیزار برێکی تووتن بداتێ، بەڵام سیزار ئەوی هەر وەبیر نەمابوو. شۆخۆف گەڕایەوەو بێ ئەوەی متەق بکا، لە نووسینگەی کارگە وەدەرکەوت.

***



هەوای دەرێ ناخۆش نەبوو. زۆری نەکردبووە بەند. بۆ ئەوە دەبوو دیوار دابنێن. شۆخۆف کە بەناو رچەیەکی باریکی نێو بەفرەکەدا دەڕۆیی، چاوی بە کوتە ئاسنێک کەوت کە لەوێ کەوتبوو. تیخەڵە شکاوێکی پۆڵا بوو. نەیدەزانی بە کاری چی دێ، بەڵام رۆژی خۆی لەوانەبوو بە کەڵکی شتێک بێ. هەڵیگرتەوەو لە بەرکی پانتۆڵی نا. دەبوو لە شوێنێکی ئۆردووگا بیشارێتەوە.

کە لە دەرێڕا دەهاتیە ژوور تا دەمێک چاوت روون نەدەبۆوە. هەر وەک دەرەوەش ساردبوو. پێدەچوو هێندێکیش شێدار بێ.

زۆربەی خەڵکەکە لە دەوری سۆبەکان هاڵابوون، ئەو سۆبانەی کە شۆخۆف یەکێکیانی دامەزراندبوو. سۆبەکەی تر زیخیان لەسەر دەتواندەوەو هەڵمی لێ هەڵدەستا. زیندانییەکانی دی لەسەر لێوی لێکدەری چیمەنتۆکە دانیشتبوون. سەردەستە لەبەر سۆبە نانی دەخوارد. پاڤلۆ شێوەکەی بۆ گەرم کردبۆوە. لە نێو دەستەدا سرتوخورت دەهات و پێدەچوو هەمەوو بە دەماخ بن. شۆخۆف گوێی لە هەواڵەکە بوو. سەردەستە توانیبووی جیرەیەکی باشیان بۆ وەربگرێ. قایل و دڵخۆش لە نووسینگەڕا گەڕابۆوە.

تیۆرین بەس خۆی دەیزانی پەڕی راپۆرتی کاری چتۆ پڕ کردۆتەوە. تانیوەڕۆیە چ کارێکی وایان نەکردبوو. دامەزراندنی سۆبەو گرتنی پەنجەران بە کاربەدەستانی کارگە چی؟ ئەو کارانەیان لەبەر خۆیان کردبوون و نەیاندەتوانی وەک بەرهەمی کار بیانقەبڵێنن. بەڵام بە هەر شێوەیەک، دەبوو شتێک لەو پەڕە کاغەزە بنووسن. رەنگە سیزاریش بۆ پڕکردنەوەی کاغەزەکە یارمەتیی تیۆرینی دابێ. بە خۆڕایی تیۆرین هێندەی چاو بەسەرەوە نەبوو.

تیۆرین بە دەستی پڕ گەڕابۆوە، کەوابوو دەستەکەیان تا پێنج رۆژ و بەلانی کەمەوە تا چوار رۆژی دی جیرەی چاکی هەبوو. کاربەدەستان هەمیشە لە قووتی پێنج رۆژ، رۆژێکیان لێ دەگێڕانەوەو بەقەد یەکیان خواردن دەدانێ، چ ئەوانەی خۆیان ماندوو دەکردو چ ئەوانەی خۆیان دەگنخاند. بەم جۆرە بە برسی کردنی زیندانییەکان، خۆراکێکی زۆریان بۆ دەمایەوەو دەستیان پێوە دەگرت. چ قەیدی بوو؟ زیندانی بە هەمەوو جۆرێک دەیگوزەراند. تێر یان برسی، ئەمڕۆی دەگەیاندە سبەینێ و سبەینێش رۆژێکی لە نوێ بوو. زیندانی، برسیایەتیی شەوانی بەو هیوایەوە بەسەر دەبرد.

بە هەر شێوەیەک کە لێکت دەدایەوە، دەردەکەوت بەپێی ئەو بەرنامەیە، بۆ پێنج ڕۆژ کار تەنیا بەشی چوار ڕۆژیان خواردن دەدایەی.

هەموویان بێدەنگ بوون. هەندێک بە دزی جغارەیان دەکێشا. لە تاریکاییدا دانیشتبوون و چاویان لە کلپەی ئاگرەکە بڕیبوو. دەستە، دەتگوت بنەماڵەیەکی گەورەیەو ئەندامەکانی هەموو خزم و کەسی یەکترین. سەردەستە، لە پەنا سۆبە، سەربهۆردێکی بۆ یەک دوو کەسان دەگێڕایەوەو ئەوانی دیکەش گوێیان دابوێ. تیۆرین زۆربڵە نەبوو، ئەگەر جاروبار وەقسە هاتبا نیشانەی ئەوە بوو کەیفی سازە.

سەردەستە ببڕای ببڕ فێری ئەوە نەبوو بە کڵاوەوە نان بخوا. کە کڵاوەکەی دادەگرت پیرتر دیاربوو. سەری پاک تاشیبوو، وەک هەموو زیندانییەک، لەبەر شۆقی ئاگرەکە مووە کورتەکانی دەبینران کە بە جارێ سپی ببوون.

دەیگوت: «من لە کن فەرماندەی گوردانیش ئەژنۆم دەلەرزی، نەخوازەڵا لە کن سەرهەنگی فەرماندە. گوتم، سەربازی لەشکری سوور، تیۆرین، گوێقوڵاغی فەرمانە قوربان.فەرماندە مۆڕەیەکی لێکردم و گوتی: ناوی خۆت و باوکت؟ وەڵامم دایەوە. ئینجا گوتی، مێژووی لە دایکبوون؟ مێژووی لە دایکبوونیشم پێ گوت. ئەو کات بیست و دوو ساڵ بووم، ساڵی ١٩٣٠، بەرەبەری توغیانم بوو. پاشان گوتی باشە تیۆرین، لە چیدای؟ ڕەق ڕاوەستام و وەڵامم دایەوە، لە خزمەت خەڵکی زەحمەتکێشدام! فەرماندە گوتی ئەوها خزمەت بە خەڵکی زەحمەتکێش دەکەی؟ ئەدی خۆت، تەرەس؟ پانتۆڵم زەرد کرد، بەڵام خۆم تێک نەداو وەڵامم دایەوە، ئەنگێوەی پلە یەکەم، بە باشترین پلە لە وانە سەربازی و سیاسییەکاندا... سەرهەنگی فەرماندە گوتی مەبەستت لە پلە یەکەم چییە، سەگباب؟ مەگەر تۆ کوڕە «کوولاک»[١٠]نی؟ لە «کامێن»ەوە ڕاپۆرتیان بۆ ناردووین و تۆ ئەوەت شاردبۆوە. دوو ساڵە لە دواتن! سەرم لێشێوابوو، زمانم لاڵ ببۆوە. ساڵێک بوو نامەم بۆ ماڵەوە نەنووسیبوو، لە ترسی ئەوەی نەکا ئەدرێسەکەم لێ ئاشکرابێ. نەمدەزانی کەسوکارم ماون یا مردوون، ئەوانیش هەواڵی منیان نەبوو. فەرماندە نەڕاندی: تۆ کابرایەکی بێویژدانی. تۆ درۆت لەگەڵ دەوڵەتی کرێکاران و جووتیاران کردووە. پێم وا بوو بە مست و پێلەقە دامدەگژێتێ، بەڵام دامنەگژایە. فەرمانی دا هەر ئەو ڕۆژە کاتژمێر شەش، لە سوپام وەدەرنێن. مانگی نۆڤەمبەر بوو. جلی زستانییان لەبەر داڕنیم و



کراسێکی شڕو پاڵتۆیەکی زۆر قوڵەیان دەبەر کردم. وا وڕ و کاس ببووم لە بیرم نەبوو تاقمە جلوبەرگێکی زستانیم هەیەو بۆم هەیە لەگەڵ خۆم بیانبەم. پارچە کاغەزێکیان وە دەستی دام کە حوکمی دەرکردنەکەم بوو... لە سەر باوکێکی کوولاک... چ ڕابردوویەکی پڕشنگدار بۆ دۆزینەوەی کار! دەبوو بە قەتار بچمەوە ماڵێ. بلێتیشم نەبوو. تەنانەت بەشی ڕۆژێکیشیان خواردن نەدابوومێ. ئاخرین جار کە نانم خوارد، هەر ئەو دوایین شەوە لە خەوگە بوو کە بۆ سۆزی دەریانپەڕاندم... بە هەڵکەوت، ساڵی سی و هەشت، لە ئۆردووگای کاتیی کۆتلاس تووشی گرووبانەکەی پێشووم هاتم. ئەویش دە ساڵیان بۆ بڕیبۆوە. لەوم ژنەفت کە سەرهەنگی گۆڕین و جێگرەکەیان، ساڵی سی و حەوت گوللەباران کردوون. جا ئیتر ڕەچەڵەکیان چ بووە، بنەماڵەکانیان کرێکار بوون یان کوولاک، ویژدانیان هەبووە یان نا، هیچی لە مەسەلەکەیان نەگۆڕیوە... خاچم کێشایەوەو گوتم، کەوابوو لەو عاسمانانە دەبێ خوایەک هەبێ، خوایەک تا بلێیی بە سەبرە، بەڵام کە سەبری لێبڕا، تا بلێیی بە زەبرە.»

شۆخۆف پاش خواردنی دوو قاپ شێو، تابلێیی تاسەی جغارەی کردبوو. بیری لەوە دەکردەوە لە ئوستونییەکان قەرز بکاو پاشان کە یەک دوو پیاڵە تووتنی لە لاتڤییەکە کڕی، بیانداتەوە. بە چپە بە یەکێ لە ئوستوونییەکانی (ئەوی ماسیگر) گوت:

«گوێ بگرە ئینۆ، کەمێک تووتن، تەنیا بەشی جغارەیەکم هەتا سبەینێ بەقەرز بدەیە. خۆت دەزانی دەتدەمەوە.»

ئینۆ چاوی لە چاوان بڕی و ئینجا سەیرێکی زڕبرایەکەی کرد. هەرچی هەیانبوو بەنیوەیی بوو. بەبێ پرسی یەکتر مسقاڵێکیان شت نەدەبەخشی. پێکەوە ورتە ورتێکیان کردو ئینۆ کیسە تووتنە گوڵچن کراوەکەی دەرهێنا. هێندێکی تووتن لەسەر دەستی شۆخۆف ڕۆکرد، تەواو بەشی جغارەیەک.

شۆخۆف لەو ڕۆژنامەیەی پێی بوو، تیتۆڵێکی لێ دادڕی. تووتنەکەی تێوە پێچاو بە پۆلوویەکی نیوە داگیراو کە لەبەر پێی سەردەستە کەوتبوو جغارەکەی هەڵکرد. ئینجا وەبەر مژانی دا. دووکەڵەکەی قووت دا، مژێکی دیکەش! گێژو وێژ بوو. هەموو گیانی خاو بۆوە.

لەگەڵ یەکەم مژی جغارەکە، هەستی بەوە کرد جووتە چاوێکی کەسک سەرنجیان داوەتێ. فتیۆکۆف بوو. جێی خۆی بوو یەک دوو مژیش وەو شڕەخۆرە بدا، بەڵام هاتەوە بیری کە ملۆمۆی خۆی کردبوو و جغارەی کێشابوو. وا چاک بوو قوونچکە جغارەکەی بداتە سێنکا کلێڤشین. ئەو کلۆڵە بێئەوەی قسەکانی سەردەستەی گوێ لێ بن، لەبەر سۆبەکە دانیشتبوو و ملی بەلارەوە نابوو.

***

گڕو بلێسەی ئاگرەکە شۆقی لە دەموچاوی گڕویی سەردەستە دەدا. بەکاوەخۆ چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە. پێنەدەچوو داستانی ژیانی خۆی بگێڕێتەوە. «هەر سڕو سپیالێکی پێم بوو بە چارەگی نرخی خۆی دامە دەلالێک و لە بازاڕی رەش دوو نانم پێ کڕی. ئەودەم تازە نانیان جیرەبەندی کردبوو. بیرم لێکردەوە دەتوانم بە قەتاری بارهەڵگر بڕۆم، بەڵام بە توندی پێشیان پێدەگرت. پارەشت هەبا نەتدەتوانی بلیتی قەتار بکڕی، نەخوازەڵا بەبێ پارە! دەبوو جەوازی سەفەرت پێ بێ. یان مەئموورییەتیان دابایەی. بە دزیەوەش نەدەکرا سواری قەتار بی. میلیشیا سەکۆکانی دەپشکنین و وێستگەش پڕ لە پاسەوان بوو. رۆژ خەریکبوو ئاوا دەبوو، قوولکەی پڕ لە ئاوی باران دەیانبەست. شەو لە کوێ مابامەوە؟ بەسەر دیوارێکی خشتەدا پازم دا. نانەکەم پێمابوو. چوومە ئاودەستخانەی وێستگەی قەتار. قەیرێک لەوێ مامەوە، دیتم کەسم بەدواوە نییە. هاتمەوە دەرێ. ئەنئەهو رێبوارێک، سەربازێکم. قەتاری «ولادی وستک- مۆسکۆ» لە وێستگە بوو. خەڵک لە دەوری شێرەی ئاوی گەرم بە کتریەکانیانەوە وەسەر شان و کۆڵی یەکتر دەکەوتن. لەنێو جەماوەرەکە چاوم بە کچێک کەوت، جلێکی شینی لەبەردابوو و نەیدەوێرا بچێتە پێش، لەوە دەترسا لاقە باریکەکانی وردوخاش بکەن. گوتم ها، ئەوە رابگرە. نانەکەم وێ داو گوتم، من ئاوت بۆ دێنم! وەختێکی چاک ئاوەکەم هێنا، قەتار خەریک بوو وەڕێ دەکەوت. کچۆڵەکە، نانی من پێ، دەگریاو نەدەیزانی چ بکا. خەمی کترییەکەی بوو. هەرام کردێ: غاردە! غاردە! من دەتگەیەمە قەتار. کچۆڵە وێڕای من بەرەو قەتار بازرەی بەست. بە دەستێک هەڵم هێناو سوارم کرد. قەتارەکە وەڕێ کەوتبوو. بۆ خۆشم بازم دا سەرێ. پاسەوانی قەتار فڕێی نەدامەوە خوارێ. سەربازی دیکەشی تێدابوون و پێی وابوو لەگەڵ ئەوانم.»

***



شۆخۆف ئانیشکێکی لە قەبرغەی سێنکا کوتا، تا قوونچکە جغارەکەی لێ وەربگرێ. بە دارجغارەوە وێی دابا. بە دارجغارەکە بیکێشێ. شۆخۆف فەرقی پێ نەدەکرد. سێنکاش پیاوێکی رێکوپێک بوو. هەتیوی ماڵوێران دەستی بە نیشانەی رەت کردنەوە لەسەر سینگی داناو وەک ئەکتەرێک خۆی نوشتاندەوە. سەردەستە لەسەری رۆیی: «شەش کچی دیکەش لەناو کووپەی قەتارەکەدا بوون. کووپەکە دەربەست هی ئەوان بوو. خوێندکاری زانکۆی خەڵکی لینینگراد بوون و لە سەفەرێکی فێرکاری دەگەڕانەوە. نان و رۆنی کەرەو هەموو جۆرە شەوچەلەیەکیان لە پێش دەبینرا. بارانییەکانیان بە گیرەی کووپەکەدا کردبوون. جانتاکانیان رووکێشدار بوون. ئەمانە چیان لە ژیان دەزانی؟ بە هەموو شتێک شادو دڵخۆش دەبوون... پێکەوە دواین، گەپمان لێداو چامان خواردەوە. ئینجا لێیان پرسیم جێگای من کامەیە. هەناسەیەکم هەڵکێشاو راستیەکەم پێگوتن. گوتم کچینە، ئەو ڤاگۆنەی منی تێدام یەکسەر دەچێتە دنیای دی...»

هەموو هەست و خوستیان لە خۆیان بڕیبوو. تەنیا ئاگری نێو سۆبەکە نێڵە نێڵی دەهات.

«دوای پەکوو پەکوویەکی زۆر، سەرەنجام بڕیاریان دا لە ناو پاڵتۆ بارانیەکانیان، لەسەر تەختەکەی سەرەوەدا بمشێرنەوە. بە درێژایی رێگا، تا «نۆڤۆسیبریک» هەر لەوێ خۆم مەلاس دا... دواتر بە هەڵکەوت لە ئۆردووگایەکی «پچۆ»دا، چاوم بە یەک لەو کچانە کەوتەوەو توانیم قەرەبووی ئەو چاکەیەی بۆ بکەمەوە. ساڵی سی و پێنج لەسەر کێشەی «کیرۆڤ»[١١] گیرابوو. کاری گرانی ئۆردووگا بڕستی لێ بڕیبوو. سمێڵی چەند کەسم چەور کرد تا بۆ کارگەیەکی بەرگ دروون گواستیانەوە.»

پاڤلۆ لەبەر خۆوە بە سەردەستەکەی گوت: «ئەرێ شفتە نەگرینەوە؟» بەڵام سەردەستە گوێی نەدایە. سەرگوزشتەکەی درێژە پێدا.

«شەو درەنگانێک گەیشتمەوە ماڵێ و بە حەوشەی پشتەوەدا چوومە ژوورێ. هەر ئەو شەوە برا چکۆڵەکەم رەگەڵ خۆم دا و وەڕێ کەوتمەوە. بردمە باشوور، بۆ «فروونێز»، ئەوێ هەوای خۆشتر بوو. هیچ خواردنم پێنەبوو بیدەمێ، بۆخۆشم برسیم بوو. لە شەقامێکی فروونێز، لە پەنایەک، قیریان بۆ قیرەتاو لە قەزانێکدا دەکوڵاند. تاقمێک خۆڕی و تۆری لێ هاڵابوون. چووم لە لایان دانیشتم و گوتم کارم پێتانە، جەنابنۆ. ئەو برایەی من چ نازانێ، لەلای خۆتان رای بگرن و فێری کەن چۆن زیندوو وەمێنێ. ئەوانیش وەریانگرت. خۆزی بۆ خۆشم لەوێ مابامەوە...»

گەمیەوان پرسی: «پاشان قەت چاوت بە برایەکەت نەکەوتەوە؟»

تیۆرین باوێشکێکی داو گوتی:

«نا، ئیتر چاوم پێ نەکەوتەوە.»

باوێشکێکی دیکەی دا و گوتی: «گرینگ نییە، کوڕینە ئێرەش وەک ماڵی خۆمان وایە. ئێوە کە هەر دەبێ شفتەکە بگرنەوە، وا چاکە دەست پێبکەن. چاوەڕێی فیتفیتە مەبن.»

***

ئەوە تایبەتمەندیی دەستە بوو. کاربەدەستان، تەنانەت لە کاتی کارکردنەکەشدا بە خورتی کاریان بە زیندانی دەکرد. کەچی سەردەستە گوتبای دەی، پیاو هەر کارێکی گوتبای بۆی رادەپەڕاند. تەنانەت ئەگەر وەختی پشوودانی نیوەڕۆیەش با. ئاخر رسق و رۆزیت بە دەستی ئەو بوو و لە خۆڕاش هیچ کارێکی پێنەدەکردی.

ئەگەر شفتەکە پێش لێدانی فیتە نەگیرابایەوە، وەستاکان لە کاتی خۆیدا دەستیان نەدەکەوتە سەر کار.

شۆخۆف هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەرزەپێ هەستا.

«من دەچم سەهۆڵی دیوارەکان پاک دەکەمەوە.»

کولنگێک و رنەکێکی تێلی بۆ خاوێن کردنەوەی سەهۆڵ، کوتکێکی دار بۆ چوخساندنی کەرپووچان، تەراز و تەناف و شاوڵیشی هەڵگرتن.

کیلگاس چاوێکی لە شۆخۆف کرد. وەک بە زمانی بێزمانی پێی بڵێ بۆچی پێش ئەوەی سەردەستە فرمان بدا، دەست بەکار دەبێ؟ کیلگاس پەکی بە نانی دەستە نەدەکەوت. کەم با و زۆر با هەر پێی وەک یەک بوو. لە سایەی ئەو خۆراکانەی بۆیان دەنارد نەیدەزانی برسیایەتی چییە.

سەرەڕای ئەوە شۆخۆف هەستا. جوان نەبوو لەوێ دابنیشێ و کاری دەستە وە پاش بکەوێ.

کیلگاس گوتی: «راوەستە، ئیڤان، منیش دێم.»



بەڵام ئەو خیگەیە با هەر لەوێ پان ببایەوە. ئەگەر گونی پێ چووبا پێش ئەو هەڵدەستا. (شۆخۆف لەبەر شتێکی دیکەش پەلەی بوو. دەیویست دەستی خۆی رەپێش بێخێ و خۆی شاوڵەکە ببا. تەنیا یەک شاوڵیان لە عەمبار وەرگرتبوو.)

پاڤلۆ لە سەردەستەی پرسی: «سێ کەس بۆ دیوار دانان بەسە؟ پێویست دەکا کەسی دی بنێرینە سەرێ؟ ئەدی بۆ شفتە؟» تیۆرین نێوچاوانی تێک ناو لە فکر رۆچوو.

«بە خۆمرا دەبینە چوار کەس، پاڤلۆ تۆ لێرە بەسەر شفتەکە رابگە. لێکدەرەکە گەورەیەو شەش کەسیش دەتوانن کاری لەسەر بکەن. لە سەرێکەوە شفتەی لێ بەتاڵ بکەن و لە سەرێکی دیکەوە زیخ و چیمەنتۆی تێبکەن. لە بیرت بێ نابێ یەک دەققەش دەستمان بەتاڵ بێ.

پاڤلۆ یەکسەر وەڕێ کەوت. تەمەنی زۆر نەبوو و هێشتا کاری ئەستەمی ئۆردووگا، رەنگ و رووی نەشەمزاندبوو. گۆناکانی هێشتا بەو کولێرە ئۆکرانییانەی خواردبوونی خڕ و شەق بوون. پاڤلۆ گوتی: «ئێوە دیوار دانێن و منیش شفتە دەگرمەوە. جا دەبینی کێ، کێ بۆڕ دەدا! کوا پێمەڕە لە کوێیە؟»

***

زیندان ئەو مرۆڤانەی وا لێکردبوو. هەر ئەم پاڤلۆیە سەردەمێک بە چەکەوە بەنێو جەنگەڵدا دەخولایەوەو شەوانە بەسەر گوندانی دادەدا. بەڵام ئێستا چۆن بوو ملی بۆ کاری کوشندەی ئۆردووگا راکێشابوو؟ مرۆ نەیدەتوانی بە گیان و دڵ خۆی بۆ سەردەستەکەی ماندوو نەکا.

***

شۆخۆف و کیلگاس رۆیشتن. گوێیان لە کرپەی پێی سێنکا بوو کە بەدوایاندا سەردەکەوت. کەوابوو ئەویش بەو گوێچکە گرانەی خۆیەوە لە مەسەلەکە گەیبوو.

تازە دەستیان بە دانانی دیوارەکانی نهۆمی دووەم کردبوو. تەنیا سێ چینیان دانابوون. ئەو بەشەی کار- کاتێ بەرزایی دیوارەکە لە ئەژنۆوە تا سینگی مرۆ دەهات- خۆشترین بەشی کارەکە بوو و پێویست نەبوو بچنە سەر داربەست.

ئەو زیندانییانەی پێشتر ئەو دیوارانەیان دانابوون، داربەستەکانیان لێکردبوونەوەو بردبوویاننە خانوویەکی تر، یان سووتاندبوویانن، تەنیا بۆ ئەوەی نەکەونە دەست دەستەیەکی تر. سبەی دەبوو لە فکری داربەستیشدا بن، دەنا پەکی کارەکەیان دەکەوت.

لەو سەرەوە دەوروبەری وێستگە هەموو دیاربوو. زەویی کارگە یەکبەر سپی بوو، زیرِوحێک لەسەر ئەو بەفرە نەدەبینرا. (زیندانییەکان هەر کام خۆیان لە کون و کەلەبەرێک گرتبوو هەتا پێش ئەوەی فیتە لێبدەن، خۆیان گەرم بکەنەوە.)

بورجی دیدەوانییەکان دیار بوون و تیرەگی تێلبەندەکان، لەبەر تاوێ تێلەکانیان نەدەبینران. هەتاوێکی پرِتیشک بوو، کە بەرامبەری رادەوەستای چاوت هەڵنەدەهات. مۆلیدەی هەڵمی لەوێ دوور نەبوو. چرِە دووکەڵێکی رەشی بە هەوادا بڵاو دەکردەوە.

مۆلیدەکە وە پرتە پرت کەوت. کاتێ دەیویست فیتە لێ بدا وەک نەخۆشان پشووی هەڵدەمالاَ. فیتەی لێدا. کەواتە زۆریش زوو دەستیان بەکار نەکردبوو.

کیلگاس قیژاندی: «هۆ کرێکاری نموونە!! شاوڵت لە بیر نەچێ!»

شۆخۆفیش لە وەڵامی ئەو گاڵتەیەدا گوتی: «برِوانە، دیوارەکەی تۆ چەندی سەهۆڵ پێوەیە! بلێیی بتوانی تا بەیانی پاکی بکەیەوە؟ ئەگەر پێت خاوێن نەکرێتەوە، ماڵنجەکەت بێکار دەمێنێتەوە!»

دەیانویست هەر کام لەسەر ئەو دیوارانەی بەیانی دەسنیشانیان کردبوون دەست بەکار بن کە سەردەستە بە دەنگی بەرز گوتی: «هۆی، دەگەڵ ئێوەمە! دوو دوو لەسەر دیوارێک کار دەکەین، با شفتەکە نەیبەستێ. شۆخۆف تۆ و سێنکا لەسەر دیوارێک بن، منیش لەگەڵ کیلگاس. پاڤلۆش دیواری کیلگاسم بۆ خاوێن دەکاتەوە.»

شۆخۆف و کیلگاس سەرنجێکی یەکتریان دا. راستی دەکرد، بە دوو کەسان کارەکە چاکتر رادەپەرِی. کولێنگەکانیان دەست دانێ.

شۆخۆف ئێستا ئیتر دیمەنی بریسکەی تیشکی خۆری لەسەر بەفرەکە لێوە دیار بوو، هەروەسا ئەو زیندانییانەش کە لە پەناو پەسیوەکان دەهاتنە دەرێ و بەو دەشتە وەردەبوون. هێندێکیان دەچوونە سەر ئەو قوولکانەی بەیانی هەڵیانکەندبوون و تاقمێکی دیکەشیان



دەچوونە تەعمیرگا، تا کاریتە لێژەکانی باوێنە سەر. ئێستا تەنێ دیوارێکی لێرِا دیار بوو کە لە گۆشەی لای چەپەوە تا نێوقەدی دانرابوو و لای راستیشی دەگەیشتە دیواری کیلگاس. شوێنی خاوێن کردنەوەی سەهۆڵەکانی پێشانی سێنکا دا و بۆ خۆشی بە هەرتک سەری کولێنگەکە کەوتە وێزەی سەهۆڵی سەر دیوارەکە. هەموو جارێ کە دایدەوەشاندێ، پرِیشکی سەهۆڵ بە هەوا وەردەبوون و وە دەموچاوی دەکەوتن. گەرمی کار ببوو، بەڵام هۆشی لە جێیەکی دیکەبوو. وێنای دیوارێکی دێنا بەرچاوی خۆی کە ئێستا وەبن سەهۆڵ کەوتبوو و بە ئەستوورایی دوو خشت لە دەوراندەوری ئۆردووگا درابوو. نەیدەزانی کێ پێشتر ئەو دیوارەی داناوە، بەڵام هەر کەس بووبێ لە کاری وەستاییدا هرِەی لە برِە نەکردۆتەوە. کارەکەی ترِەکەڵەک بووە. بەڵام شۆخۆف ئێستا بە جۆرێک سەهۆڵەکانی لێ دەکردنەوە وەک خۆی دایناببێ. دیوارەکە لە شوێنێک قووپابوو کە بۆ تەراز کردنی دەبوو سێ چین دیوار بە شفتەی خەست سەر لە نوێ دابنێینەوە. لە زەینی خۆیدا دیوارەکەی کردە دوو بەش. خۆی نیوەی لای چەپەی دادەناو نیوەکەی تری تا ئەو جێگایەی لەگەڵ بەشی کیلگاس تێکەڵ دەبۆوە، دەدایە سێنکا. بیری کردەوە کیلگاس کە دەگاتە سیلەی لای راست، چەند کەرپووچێکیش بۆ سێنکا دادەنێ و کارەکەی ئاسانتر دەکا. هەمان کات ئەویش لە نیوەکەی خۆی دەبێتەوە. لێکی دایەوە بزانێ چەندیان کەرپووچ دەوێ. هەر کە کەرپووچەکانیان هێنایە نهۆمی دووەم، شۆخۆف گازی ئالیۆشای کرد: «بێنە بۆ ئێرە. لێرەیان رۆکە!»

سێنکا لە پاککردنەوەی سەهۆڵەکان ببۆوە. شۆخۆفیش رنەکە تێلەکەی هەڵگرت و دەستی بە داتاشینی سەر دیوارەکە کرد. رنەکەکەی هێند بەسەر خشت و بەندەکاندا هێنا تا تەنیا توێخێکی رەنگ خۆڵەمێشیی سەهۆڵ بە دیوارەکەوە ما. لەوکاتەدا کە خەریکی رنەک لێدان بوو، تیۆرینیش هاتە سەرێ و تەرازەکەی لە سیلەی دیوارەکە قایم کرد. شۆخۆف و کیلگاس پێشتر تەرازی خۆیان قایم کردبوو.

پاڤلۆ لە خوارێرِا هاواری کرد: «هۆی! خۆتان بگرن، شفتە هات.» شۆخۆف ئارەقەی کردبوو. هێشتا تەنافی نەبەستبوو. بیری کردەوە کە لانی کەم بۆ سێ چین دایبەمزرێنێ. بۆ ئەوەی کاری سێنکا ئاسانتر بێ، وا چاک بوو خۆی رووکاری دەرەوە دابنێ. کە تەنافەکەی دەبەست بە دەنگی بەرز بە ئاماژەی دەست سێنکای تێگەیاند کە لە کوێرِا

دەست پێبکا. سێنکا لێوی خۆی گەزت و بە پێکەنینەوە ئاماژەی بە دیواری تیۆرین کرد. وەک ئەوەی بڵێ، پێتان دەسەلمێنین کێ زووتر لێ دەبێتەوە.

شفتەیان وەسەر خست. هەشت زیندانی، دوو دوو زەنبەڵیان پێبوون. سەردەستە پێی گوتبوون شفتەکە لەسەر عەرز ڕۆنەکەن–چونکە دەمودەست دەیبەست– دەبوو لەبەر دەستی وەستاکانی دابنێن و تا بەتاڵ دەبوو، لە باتی ڕاوەستان لەو بەر سەرمایە، خشتان بێننە پێشێ. کە زەنبەڵەکان بەتاڵ دەبوون، دەیانبردنەوە خوارێ و دوو کەسی دی خێرا بە زەنبەڵێکی پڕەوە سەر دەکەوتن. زەنبەڵە خاڵییەکەیان دەبوو بردبا پەنا سۆبە، تا سەهۆڵی پاشماوەی شفتەکە بتوێننەوەو خۆشیان گەرم کەنەوە.

دوو زەنبەڵ پێکەوە هاتنە سەرێ. یەکیان لە پەنا دیواری کیلگاس و ئەوی دیکەیان لە کن دیواری شۆخۆف دانا. شفتەکە ئەگەرچی زۆر گەرم نەبوو، بەڵام لەو تۆف و سەرمایەدا هەڵمی لێهەڵدەستا. دەبوو هەر خێرا لەسەر دیواریان ڕاخستبا، دەنا دەیبەست . ئەگەر بەستباشی ورد کردنی نە کاریماڵنج بوو نە هی کوتکە دارەکە. خشتێک نەکەوتبا جێی خۆی هەروا خوار دەیبەست. ئەودەم پیاو هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات بە کوڵینگ شفتەکە ورد بکاو خشتەکە هەڵقەنێتەوە.

بەڵام شۆخۆف قەت لە کاری خۆیدا سەرچیغ نەدەچوو. هەر خشتێکی داینابا، لە شوێنی خۆی بوو. ئەگەر خشتێک خوارو خێچ یان شکاو بایە زۆر زوو دەیزانی و لە چینەکەدا لە شوێنێکی گونجاوی دەترینجاند. شفتەکە کە هەڵمی لێهەڵدەستا، بە ماڵنج هەڵیدەگرت و لەسەر دیوارەکە پانی ڕا دەکرد. هەمیشە بەقەد ئەوەی پێویست بوو، کەرپووچی دەکار دەکرد. ئینجا خشتێکی دیکەی لە زەوی هەڵدەگرت. خشتە دڕ و زوورەکانی بە هێواشی دەست دەدانێ، تا دەستکێشەکەی نەدڕن. بە ماڵنج شفتەکەی لووس دەکرد و خشتەکەی لەسەر دادەنا. لە چاوترووکانێکدا دەبوو خشتەکە تەراز بکرێ و بە لێدانی کلکە ماڵنجێک کەوتبا جێگای خۆی، بە جۆرێکی وا بە ڕووکاری دەرەوەدا مووی لێنەدەداو خشتەکان بە هەموو بارێکدا لێکولووس بوون و دەیانبەست. ئەگەر شفتەکە لە بن خشتەیەکەوە دەرفلێقابا دەبوو دەستوبرد بە ماڵنج تاشیبایان. (هاوینان دەکرا بۆ چینی دیکە دەکاری بکەیەوە، بەڵام زستانان ئەوە نەدەکرا.) جاری وابوو خشتێک لێوی شکابوو، ئەودەم بۆ داپۆشینی شکاوابیەکەی شفتەی پتریان دەکار دەکرد. دەبوو خشتە



شکاوەکەت وردە وردە بە خشتی تەنیشتیەوە نووساندبا و ئەو دەم شفتە زیادەکە دەهاتە دەرێ.

ئیتر دەستی گەرم داهاتبوو. ئەو یەک دوو چینەی لە جیاتی شوێنی خشتە ورگ داوەکان دانابوو و ئیتر کارەکەی خۆشتر ببوو. بەڵام ئەوجار دەبوو هۆش و گۆشی تەواو کۆ بکاتەوە.

لێکدا لێکدا کەرپووچی بە ڕووکاری دەرەوەدا دادەنان، بۆ ئەوەی بگاتەوە سێنکا. دوورو نێزیکی سێنکا ببوو. سێنکاو سەردەستە لە گۆشەیەکەوە دەستیان پێکردبوو، بەڵام ئێستا سەردەستە دیوارەکەی دیکەی دادەنا. شۆخۆف ئاماژەی بۆ یەکێ لە زەنبەڵکێشەکان کرد تا شفتەی بۆ بێنن. سەری خۆی پێ نەدەخورێنرا.

کاتێ لەگەڵ سێنکا گەیشتنەوە یەک، لە یەک زەنبەڵیان شفتە دەکار کرد و هەر زوو زەنبەڵەکە خاڵی بوو.

شۆخۆف لە حاڵێکدا ڕووی لە دیواردا بوو هەرای کرد: «شفتە، شفتە.»

پاڤلۆ وەڵامی دایەوە: «وا هات!»

زەنبەڵێکی تر گەیشتێ و ئەوەی هێشتا نەیبەستبوو، شفتەکەیان دەکار کرد. شفتە بە قەراغی زەنبەڵەکەوە بەستبووی. بە زەنبەڵکێشەکانیان گوت کە شفتە بەستووەکان بکرێنن. بارێکی قورس و بێکەڵک بوو کە دەبا بۆ خۆیان بەپلیکاناندا سەرو خواری پێبکەن.

«ئێ، تەواو بوو، یەکی دی.»

ئیدی سەرمایان نەبوو. جموجووڵ و تینی کار، یەکەم شەپۆلی گەرمایان لە لەشیاندا هەست پێکرد. –ئەوە کاتێک وابوو کە بن پاڵتۆ و کەوا و هەر دوو کراسی بەری پیاو ئارەقەیان کردبا– بۆ ساتێکیش هەدایان نەدەدا و وەک دێوانان دیواریان دادەنا. دوای کاتژمێرێک کەللەیان وا گەرم داهاتبوو، ئارەقەیان بە لەشیەوە وشک دەبۆوە. گرینگ لاقیان بوون، سەرمایان نەبێ. شوێنی تر زۆر گرینگ نەبوون. ئەو کزەبایەی هەڵیکردبوو دەستی پێ شل نەدەکردنەوە. تەنیا سێنکا پێی لە زەوی دەکوتا. پێی زل بوون و چەکمەی بۆ نەدەبوون.

سەردەستە بەردەوام دەینەڕاند و داوای شفتەی دەکرد، هەرا هەرای شۆخۆفیش نەدەپسایەوە. لە حەندە حەندی کارێکی سەختدا پیاو هەمیشە خۆی لە خەڵکی دی پێ بەرزترە، بۆ شۆخۆف ئەوە گرینگ بوو دوا نەکەوێ، بۆیە نەیدەهێشت ئەوانەی زەنبەڵیان پێیە تاوێک هەدا بدەن.

لە سەرەتای کاردا گەمیەوان و فتیۆکۆف پێکەوە زەنبەڵیان دەکێشا. گەمیەوان نەیدەتوانی بە گورجی بەو پلیکانە تەڕو تەسکانەدا ژێر و ژوور بکا و دوا دەکەوت. شۆخۆف غیرەتی وەبەر دەنا:

«زوو بە گەمیەوان، کەرپووچ، گەمیەوان»

گەمیەوان کە وە سەر پلیکانەکان دەکەوت جار لە جارێ گورجوگۆڵتر دەبوو، کەچی فتیۆکۆف پتر فل دەبوو. ئەو داڵک حیزە زەنبەڵەکەی خوار رادەگرت تا شفتەکە لە سەریەوە بڕژێ و باری سووکتر بێ.

شۆخۆف لە دوایەڕا پاڵی بە فتیۆکۆفەوە نا و گوتی: «نێوزگ رزیو، دڵنیام ئەو کاتەی شتێکت بە دەست بووە بەردەستەکانت فوو داون!»

گەمیەوان هاواری لێ بلند بوو: «قوربان، جێی من بگۆڕە، من لەگەڵ ئەو زۆڵەدا کارم پێناکرێ.»

تیۆرین لێکی هەڵاواردن. فتیۆکۆفی نارد لەسەر داربەستەوە خشتان هەڵاوێ. لەوێ لەژێر چاوەدێریی خۆیاندا بوو. ئالیۆشای لە جێگای ئەو دانا تا لەگەڵ گەمیەوان شفتە بکێشن. ئالیۆشا کابرایەکی هێدی و لەسەرەخۆ بوو، دەگەڵ هەمووان دەسازا. گەمیەوان بە دەنگی بەرز پێی گوت: «بە تەواوی تواناوە بۆ پێشەوە، مەلەوان! چاولێکە ئەوان چۆن دیوار دادەنێن!»

ئالیۆشا بە پێکەنینێکی دڵپاکانەوە گوتی: «چۆن دەڵێی، وادەکەم. لەسەر دڵی تۆم.» ئینجا بە پلیکانەکاندا داگەڕان. پیاوی دەستەمۆ و بێوەی وەک ئالیۆشا لە ناو دەستەدا نیعمەتێکی گەورە بوو.

سەردەستە بەسەر یەکێکی خوارەوەیدا قیژاند. وا دیار بوو لۆرییەکی دیکەیان خشتە



هێناوە. شەش مانگ بوو خشتە هیچ سەرو سۆراخی نەبوو، کەچی ئێستا لۆری لەسەر لۆری دەیانهێنا. تا خشتە هەبا ئەوان نەدەبوو تک بدەن و راوەستن. ئەوە یەکەم رۆژ وا بوو. رۆژانی دوایی کە هێنانی خشتە پەکی دەکەوت، ئیتر هیچیان لەدەست نەدەهات.

سەردەستە دیسان هاواری لێ هەستا، ئەوانەی لە خوارەوە بوون لەمەڕ ئامێری باڵابەرەوە ئەمری پێکردن. شۆخۆف دەیویست سەرەدەر لە مەسەلەکە دەربکا، بەڵام پێی نەدەکرا. چینێکی دیوار دانابوو. دوو کەس لە زەنبەڵکێشەکان هاتنە سەرێ و گوتیان وەستای تەعمیرکار هاتۆتە سەر باڵابەرەکە. سەرکارگەری فەننیش هاتبوو. سەرکارگەری فەننی «کرێکاری ئازاد»بوو، کاتێ وەستا خەریکی چاککردنەوەی ئامێرەکە دەبوو، ئەو بە سەریەوە رادەوەستا و چاوەدێریی دەکرد.

هەمیشە هەر وابوو، یەکێک کاری دەکردو یەکی دیکەش دەبوو بە سەریەوە رابوەستێ. ئەگەر ئامێرەکەیان چاک کردبایەوە، دەیانتوانی شفتە و کەرپووچی پێ وەسەرخەن.

شۆخۆف چینی سێیەمی دادەنا. (کیلگاسیش هەروەتر.) لەو کاتەدا یەکێ لەو کاربەدەستانەی هەمیشە وەک بەڵای لابەلا پەیدا دەبوو، بە پلیکانەکاندا سەرکەوت. سەرکارگەری بیناسازی، «دێر» ناوێک بوو. خەڵکی مۆسکۆ بوو. دەیانگوت سەردەمایەک کارمەندی یەک لە وەزارەتخانەکان بووە.

شۆخۆف چووە کن کیلگاس و بە ئاماژەی پەنجە تێی گەیاند کە «دێر» هاتووە. کیلگاس شانی هەڵتەکاند و گوتی: «من کارم بەو جۆرە کەسانە نەداوە، بەڵام ئەگەر خوای کردو لە پلیکانان هەڵدێرا، پێم بڵێن!»

دێر دەهات، لە پشت سەریان رادەوەستا و سێرەی لە کارەکەیان دەگرت. شۆخۆف چارەی کەڵلەکەرێکی وای نەدەویست. سەگبابی تەرەس پۆزی ئەندازیاری لێدەدا، سەری قسەی لەگەڵ کردنەوە. جارێکیان ویستبووی شێوەی دیوار دانانیان فێر بکا، شۆخۆف وەختبوو بە پێکەنین قڕ بێ. یەکێک لافی ئەندازیاری لێدا، دەبێ بتوانێ بە دەستی خۆی دیوارێک دابنێ.

***

زێدی شۆخۆف خانووی کەرپووچی لێنەبوو. هەموو خانووەکان لە دار دروست کرابوون.

بینای قوتابخانەش هەر دار بوو. لەو جەنگەڵەدا، چ زۆر بوو؟ دار. کەچی ئێستا لە ئۆردووگا ناچار دەبوو دیواری خشتان دابنێ. چ قەیدی بوو، ئەو کارەشی لەبەردەستی حاسێ نەبوو. یەکێک لە ژیانیدا فێری یەک دوو کاران بووبێ، «دە» کاری دیکەش فێر دەبێ.

دێر لە پلیکانەکان هەڵنەدێرا. تەنیا جارێک پێی هەڵخلیسکا. دوو دوو پلیکانەکانی بڕین و سەرکەوت.

هەرای کرد: «تیۆرین!» چاوی لە ژێلاڵا هاتبوون: «تیۆرین!» پاڤلۆ بە خۆو بە پێمەڕەیەکەوە بە دوایدا هاتە سەرێ. دێر پاڵتۆیەکی لە ئی زیندانییانی لەبەردابوو. بەڵام ئەوەکەی وی نردونوێ و خاوێن بوو. کڵاوێکی قایشی گەرم و نەرمی لەسەر بوو، بەڵام ئەویش وەک کڵاوی گشت زیندانییەکان، ژمارەی پێوەبوو: «ب-٧٣١».

تیۆرین، کەمچە بە دەستەوە، بە پیریەوە چوو: «چ بووە؟» کڵاوەکەی لار ببوو و خزیبووە سەر چاوێکی.

شتێک رووی دابوو. شۆخۆف دەیویست لە بنجوبناوانی مەسەلەکە بگا، بەڵام شفتەی ناو زەنبەڵەکە دەیبەست. بە دەم دیوار دانانەوە گوێی لێ هەڵخستن.

دێر نەڕاندی: «ئەو ناماقووڵییەت بۆ کردووە؟» کەفی هەڵدەخڕاند: «ئەمجارەیان ئیتر بە گرتن لە کۆڵت نابینەوە. ئەوە تاوانێکی گەورەیە تیۆرین. دەورەیەکی دیکەی زیندانت بۆ زیاد دەکرێ.»

شۆخۆف سەری زمانی خۆی گەزت. چاوێکی لە کیلگاس کرد. ئەویش تێگەیی کەتنی لبادەکەیە! ئەو دەویدبابە لبادەکەی بە پەنجەرانەوە دیبوو.

شۆخۆف نەدەترسا، سەردەستە چاوسووری بوو. خەمی تیۆرینی بوو. سەردەستە بۆ پیاو لە باب چاترە، بەڵام بۆ کاربەدەستان زیندانییەکەو هیچی تر. لە باکوور لەسەر کارێکی وا بە لای کەمەوە دەورەیەکی دیکەیان بۆ زیندانی دەبڕیەوە. تیۆرین چاک پێوە بوو. کەمچەکەی فڕێ داو چووە لای کابرا. ئەویش چاوێکی لەدەوروبەری خۆی کرد. پاڤلۆ بە خۆو بەپێمەڕەوە لەوێ چەقیبوو. ئەو پێمەڕەیەی لە هەوانتە دەگەڵ خۆی نەهێنابوو... سێنکاش بەو گوێچکە گرانانەی خۆیەوە تێگەیبوو ئەو هەراو هۆریایە لەسەر چییە.



ئەویش دەست لە کەلەکێدا، لێیان چووە پێشەوە. سێنکا هێندەی گایەک بەهێز و هەیکەلی بوو. کابرا پێڵووی لێک نان، خۆی کۆکردەوەو ویستی فیزماڵکی بداتێ. سەردەستە سەری بردە بن گوێی و بە دەنگێکی نزم، بەڵام بە جۆرێکی وا هەموو گوێیان لێبێ، پێی گوت: «ئەو سەردەم بەسەر چوو کە گەوادی وەک تۆ تەشقەڵەیان بە پیاوان دەکرد. سەگی سەگباب، زمانت بگەڕێ، بە گۆڕی بابتدا دەڕیەنم، تێدەگەی؟»

سەردەستە هەموو گیانی وەک مێژۆک دەلەرزی و خۆی پێ ڕانەدەگیرا. پاڤلۆش وەک کوندەبوو چاوی لە کابرا زەق کردبوون. پریشکی خوێنی پەڕیبووە چاوان.

دێر گوتی: «مەیکەنە فشە، کوڕینە، مەیکەنە فشە.» ڕەنگی بە روویەوە نەمابوو، لە کن پلیکانەکان لاچوو.

سەردەستە یەک قسەی دیکەشی نەکرد. کڵاوەکەی ڕاست کردەوە، ماڵەکەی هەڵگرتەوەو ملی لەبەر کار نایەوە. پاڤلۆ بە خۆ و بەپێمەڕەوە بە ئەسپایی بە پلیکانەکاندا داگەڕا. زۆر بە کاوەخۆ.»

دێر نە دەیتوانی ڕاوەستێ و نە بڕوا. چوو لە کن کیلگاس ڕاوەستا. کیلگاس بە سەلیقەو بە پوختی خشتەی دادەنان. دەتگوت کیمیاگەرێکەو دەرمانەکانی سەنگ و سووک دەکا. پشتی لە کابرا بوو، خۆی لێ خەشیم کردبوو.

دێر بە قوونەدزە چووە لای سەردەستە. دەنگی گۆڕابوو: «چ جوابی سەرپەرشتیار بدەینەوە، تیۆرین؟»

سەردەستە بەدەم دیوار دانانەوە، بێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ، گوتی: «بڵێ هەر لەوێ بووە. بڵێ پێش ئەوەی ئێمە بێین، ئەو لبادانەی هەر لێ بوون.»

دێر هەروا خۆی دەگنخاند، ئیتر دەیزانی نایکوژن. دەستی لە باخەڵی نابوون و ئەوسەرو ئەوسەری دەکرد.

بە منگە منگ بە شۆخۆفی گوت: «هۆ، س-٨٥٤، ئەو شفتەیە بۆ وا تەنک رادەخەی؟»

سەگباب دەیویست رقی خۆی بە یەکێک بڕێژێ. هیچ بیانوویەکی نەبوو، ئێستا هاتبوو لە شفتەی هەڵکێڵابوو.

شۆخۆف بە مۆرە مۆرەوە بۆی شی کردەوە: «چاو، برای بەڕێز، ئەگەر ئێستا شفتەکە ئەستوور راخەم، ئەو وێستگەیە ناگاتە بەهارێ، دەتوێتەوە.»

کابرا نێوچاوانی تێک نا:

«تۆ وەستایەکی و سەرکارگەر چت پێ دەڵێ دەبێ وا بکەی.»

ئینجا وەک هەمیشە بای گووپی بەرەڵڵا کرد. لە راستیدا شۆخۆف شفتەکەی کەمێک تەنک رادەخست و دەیتوانی پتری رۆبکاتە سەر دیوارەکە، بەڵام بە مەرجێ هەوا خۆش با، نەک بەو سەرماو سەخڵەتە. بێویژدانانە تەنیا لە فکری زۆر بوونی کاردا بوون. ئەو مەسەلەیەت چۆن لەو زلحۆرتە گەیاندبا؟ سەگباب سەری بەردایەوە و بە پلیکاناندا داگەڕا.

بە دوایدا تیوّرین نەڕاندی: «ئەو باڵابەرەم بۆ چاک بکەوە! پێت وایە وڵاخی بارەبەرت دەست کەوتوون؟ ئەو هەموو کەرپووچەمان پێ وەسەر ناخرێ.»

دێر هەروا کە بە پلیکانەکاندا دەچووە خوارێ، گوتی: «جیرەکەیت وەرگرتووە.»

بەڵام تازە لە بەری دانواندبوون.

«ئەگەر پیاوی زەنبەڵێک لەو پلیکانانە وە سەر بخە.»

«پێت وایە بە دەست منە؟ ژمێرباری قایل نابێ.»

«هەی سندان لەو ژمێریارییەشت دا! من هەموو ئەو دەستە بۆ چوار وەستایان هەڵدەسوورێنم، هەر بۆ ئەوەی پەکی کارەکە نەکەوێ. پێت وایە لە بری ئەو گشتە کوێرەوەرییە چمان دەدەنێ؟»

تیوّرین لەگەڵ ئەوەدا کە وەڵامی کابرای دەدایەوە، بۆ ساتێکیش دەستی لەکار هەڵنەدەگرت. یەک بەخۆ نەڕاندی: «شفتە.» ئینجا شۆخۆفیش بە دوای ئەودا گوتی: «شفتە.»

چینی سێیەمیش تەواو ببوو و دەبوو دەست بە دانانی چینی چوارەم بکەن. شۆخۆف دەبوایە خێتەکە هەڵبکێشێ، بەڵام حەزی نەدەکرد خۆی بەو کارە بخافڵێنێ. بەبێ خێتیش دەکرا چینێکی دی دابنێن.

***



دێر لە گۆڕەپانەکە تێپەڕی. لە سەرمان دەلەرزی و دەچوو لە نووسینگە خۆی گەرم بکاتەوە. بەو سەردانەی وێستگە لووتی داژەنیبوو. دەبوو پێش ئەوەی لەگەڵ گورگێکی وەک تیوّرین رووبەڕوو بێتەوە مشووری هێندێک شتی خواردبا. دەبوایە لەگەڵ سەردەستەکان خۆ رێک خا. کاربەدەستانی ئۆردووگا زەڕیان بۆی نەبوو. ورگی تێر بوو، هۆدەی تایبەتیشی هەبوو. ئەدی چ بەڵای لێ بوو؟ وا چاک بوو مۆخی وەگەڕ بخاو هێندە خۆی سووک و چرووک نەکا.

یەک لە زیندانییەکان هاتە سەرێ و گوتی وەستای تەعمیرکار و موفەتیشی فەننی رۆیون. ئامێری باڵابەرەکەیان پێ وەکار نەکەوتبۆوە. کەواتە دەبێ وەکو ئێستر شفتەو خشتان بکێشنەوە.

شۆخۆف ئەوەندەی لەبیری بێ، لە چ جێیان حاڵەکە لەوە باشتر نەبوو. ئەو ئامێرانە یا هەر لە خۆوە تێکدەچوون یان زیندانی تێکیان دەدان. هاتەوە یادی جارێکیان لە ئۆردووگایەک مشاری کارەبایان خرا کرد. شیشێکی ئاسنیان لەگەڵ داران، وەبەر دابوو، نەقالەکەیان شکاند. بۆیە وایانکرد تا تاوێک بحەسێنەوە. دەبوو بێ نووچ دان موورە داریان لەسەر یەک هەڵچنیبان.

سەردەستە هاواری کرد: «کەرپووچ، کەرپووچ!» ئینجا هەموو ئەوانەی شفتەو کەرپووچیان دەکێشا، وەبەر جنێوانی دان.

لە خوارێرا هەرایان کرد: «پاڤلۆ دەپرسێ چەندتان شفتە دەوێ؟»

«جارێ بگرنەوە.»

«نیوەیەک هەیە.»

«باشە، یەکی دیکەش بگرنەوە.»

ئێستا کارەکە چاک رادەپەڕی. چینی پێنجەمیان دادەنا. دیوارەکە گەیشتبووە سینگیان و ئیتر پێویست نەبوو وەک چینی یەکەم بۆی دابێنەوە. راستە دیوارێکی بێ دەرگاو پەنجەرە کارەکەی ئاسانتر دەکرد. تەنیا دوو دیواری راستەکییان دادەنان و دنیایەکیان خشتە لە بەر دەست بوو. دەبوو تەنافەکە هەڵکێشن، بەڵام تازە وێڕا نەدەگەیشتن.

گۆپچیک هەواڵی هێنا کە دەستەی هەشتاو دوو چوون ئامرازەکان ببەنەوە عەمبار. تیۆرین چاوی لێ زەق کردن. تێی راخوڕی: «خەریکی کاری خۆت بە، سەرمازەڵە، خشتە بێنە!»

شۆخۆف سەرنجی دەورو پشتی خۆی دا. کوڕۆکە راستی دەکرد. هەتاو زۆری نەمابوو ئاوا بێ، کەوتبووە نێو خەرمانەیەکی رەنگ مۆر، کەچی ئەوان لە گەرمەی کاردا بوون. چینی پینجەمیان دادەنا و ئەوەندە کارە لە سەروماڵی ئەورۆیان زیاد بوو.

زەنبەڵکێشەکان وەک ئەسپی شەکەت، هانکەیان دەهات. گەمیەوان شین و مۆر ببۆوە. تەمەنی نەدەگەیشتە چل ساڵ، بەڵام تین و گوڕی لاوێتیی تێدا نەمابوو.

هەوا دەم لەدەمێ ساردتری دەکرد. کارت کردبا و نەکردبا، وردە وردە پەنجەت لە ناو دەستەوانانداکۆڵ دەبوون و لە گۆ دەچوون. سەرما خزیبووە نێو چەکمەی پێی چەپی شۆخۆف. چەند جار پێی لە زەوی کوتا.

تازە لەوە خەلستبوو خۆی کووڕ بکاتەوە سەر دیوار، بەڵام داهاتنەوە بۆ ئەو حەمکە شفتە و کەرپووچە، مۆغەرەی پشتی پیاوی دەشکاند.

شۆخۆف رووی کردە ئەوانەی شفتە و خشتەیان دەکێشا: «هۆی، دەگەڵ ئێوەمە کوڕگەل!» خەریک بوو زمانی لێدەدان: «بریا خشتەکانتان لێرە لەسەر دیوارەکە دانابان.»

گەمیەوان قایل بوو، بەڵام بە جارێ لە کەڵک ببوو. ئەو کارانەی نەکردبوون. بەڵام ئالیۆشا گوتی: «زۆر چاکە ئیڤان دنیسۆڤیچ، چۆنی تۆ بلێیی وا دەکەم.» ئالیۆشا «نا»ی بە دەمدا نەدەهات. هەر کارێکی پێی کرابا درێخی نەدەکرد. گەر مرۆی سەر دنیا پاکی وەک ئەو بان، شۆخۆفیش بۆ یارمەتیی خەڵک سەری پێوە نەبوو. جا پیاو کارێکی بۆ خەڵک لەدەست بێ، چی تێدایە بیکا؟

ئەو باپتیستانە دابودەستوورێکی جوانیان هەبوو.

لەوسەری گۆڕەپانەکەڕا زرینگەی چەکوچ، بەرزو بەقەو، دەگەیشتە وێستگەی کارەبا. زەنگی کۆتایی کار بوو! شفتەیان بەسەردا مابۆوە. رەچاوی وەختەکەیان نەکردبوو.

سەردەستە گوڕاندی: «شفتە! شفتە!»

شفتەیەکی زۆر مابوو کە دەبا دەکاری بکەن. چارەیان نەبوو. ئەگەر لێکدەرەکە شفتەی



تێدا ماباوە تا سبەینێ وەک دارو بەردی لێدەهات و کەس پێی نەدەهاتە دەرێ، مەگەر لێکدەرەکەیان شکاندباو لەتوپەتیان کردبا.

شۆخۆف گوڕاندی: «دەست هەڵێنن، کوڕینە، با ئەوەندە کارە نەمێنێتەوە.» کیلگاس دڵتوند ببوو. کەیفی بە کاری پەلەپرووزێ نەدەهات، بەڵام بە هەموو هێزوگوڕی خۆی دیواری دادەنا. چارەی دیکەی نەبوو. پاڤلۆ بە تاڵووکە، بە خۆی و زەنبەڵێک شفتەو کەمچەیەکەوە خۆی گەیاندە نهۆمی سەرێ. ئەویش دەیویست یارمەتییان بدا، کەوابوو ئێستا وەستای دیوار ببوونە پێنج کەس.

دەرفەتی ئەوەیان نەبوو خشتەکان راستەو پاستە بکەن. شۆخۆف هەمیشە خشتەیەکی وای هەڵدەگرت بە قەد کەلێنی سەر دیوارەکە بێ. کوتکە دارەکەی وە ئالیۆشا دا و گوتی: «ها خشتەیەکی لەو جێیە راکە پێت دەڵێم، پەلە بکە.»

بەو پەلە پەلە کاری جوان نەدەکرا. لە کاتێکدا هەموویان کەرپووچ دوای کەرپووچ دایاندەنا، شۆخۆف لێ بۆوە و چاوێکی بە دیوارەکەدا خشاند. چوو لە سووچی لای راستی دیوارەکە راوەستا و سێنکاشی ناردە سووچی لای چەپ. ئەگەر سووچەکان تەراز نەبان سبەی دنیایەکیان کار بۆ کەڵەکە دەبوو.

«راوەستە!» کەرپووچێکی لە پاڤلۆ وەرگرت و داینا. ئەو سووچەی سێنکا دانابوو عەیبدار بوو. خۆی گەیاندێ و بە دانانی یەک دوو کەرپووچان تەرازی کرد.

گەمیەوان زەنبەڵێکی دیکەی وە سەر خست. وەک بارگینی داشقە زمانیان پێ کێشابوو. هاواری کرد: «دووی دیکە ماون!» گەمیەوان خۆی پێ لەسەر لاق رانەدەگیرا. بەڵام داگەڕایەوە. شۆخۆف کاتی خۆی پیرە بارگینێکی هەبوو، جوانی پێڕادەگەیشت و خزمەتی دەکرد. بەڵام لە ئۆردووگا بارگینێکی وەک گەمیەوان تا دەپسا کاریان لێدەکێشا و دوایەش کەوڵیان دەگروو.

ئێستا خۆر خەریکی ئاوابوون بوو. پێویست نەبوو گۆپچیک بیریان بخاتەوە. ئەو دەستانەی دی دیاربوو کە ئامراز و کەرەستەکانیان بردبوونەوەو لە پێش پازگا کۆ ببوونەوە. (دوای لێدانی زەنگ هیچ کەس دەمودەست دەستی لەکار هەڵنەدەگرت. تەنیا ئەوانەی گەمژە بوون پەلەیان دەکرد تا لە دەرێ رەق ببنەوە. لە ئەنوا گەرمەکاندا خۆیان

مات دەکرد، ئینجا لە کاتێکی دیاریکراودا کە سەردەستەکان لە سەری پێکدەهاتن، هەمــوو پێکەوە وەدەر دەکــەوتن. تا ئەو کــاتە دیاریکراوە، ئەگــەر نیــوەشــەویش با، زیندانییەکان لە ئەنواکانیان نەدەهاتنە دەرێ و لەوێ دەمانەوە.)

تیۆرین وەخۆ هاتبۆوە و دەیزانی کە دەستەکەی وە درەنگی کەوتووە. ئەوانەی لە عەمباری ئامراز بوون، ئێستا هەر جنێوێکی بە زاریاندا هاتبا نەیاندەگێڕایەوە. گوڕاندی: «لە خەمی ئەو سەگبابانەدا مەبن! چاویان دەرێ. وەرنە خوار و لێکدەرەکە بەتاڵ بکەن. شفتەکە لە جێیەک بن عەرز بکەن و سەری بە بەفر بگرن، با کەس نەیبینێ. پاشان پاڤلۆ، تۆ و دوو کەسی دی هەموو ئامرازەکان کۆ بکەنەوە و بیانبەنەوە عەمبار. سێ ماڵنج دەمێنن، دوایە ئەوانیش بە گۆپچیکدا دەنێرم. ئەو دوو زەنبەڵە ماوە، ئێستا لێدەبینەوە.»

پاڤلۆ و ئەوانی دی بە لەز کوتکەکەیان لە شۆخۆف وەرگرت و تەنافەکەیان لێکردەوە. پاشان زەنبەڵکێشەکان و ئەوانەی خشتیان دەکێشا هرووژمیان کردە سەر پلیکانەکان. هیچ کارێکیان لە سەرێ نەمابوو. تەنیا سێ کەس، کیلگاس و سێنکاو شۆخۆف لەوێ مان. تیۆرین دەهات و دەچوو و چاوی بە دیوارەکاندا دەخشاند. قایل بوو. خراپ نییە، بەرهەمی کارەکەیان بۆ پاشنیوەڕۆیەک، ئەویش بەبێ ئەو بالآبەرە بەڵا لێدراوە، خراپ نەبوو.

شۆخۆف دیتی هێشتا کیلگاس کەمێکی شفتە پێماوە. لەوە دەترسا کەمچەکە لە کاتی خۆیدا نەباتەوە عەمبار و تیۆرینی لێ تووڕە بێ. بیرێکی بە مێشکیدا هات. گوتی: «گوێ بگرن کوڕینە، ئێوە کەمچەکانتان بدەنە گۆپچیک با بیانباتەوە. من بەو کەمچەیەی خۆم کارەکە تەواو دەکەم. ئەو کەمچەیەی من لە لیستی ئەواندا نییە و نایبەینەوە عەمبار.

تیۆرین پێکەنی و گوتی: «ئەگەر رۆژێک تۆمان لە نێو نەمێنێ، ئێمە قوڕی کوێندەر بکەینە سەرمان؟ کێ جێی تۆ پڕ دەکاتەوە؟»

شۆخۆفیش پێکەنی و دەستی بە کار کرد.

کیلگاس کەمچەکانی هەڵگرتن. سێنکا کەرپووچی وە شۆخۆف دەدا. شفتەی کیلگاسی لە زەنبەڵی شۆخۆف کرد.



گۆپچیک غاری دا هەتا لە عەمبار خۆی بگەیەنێتەوە پاڤلۆ. ئەوانی دیکەش بەبێ سەردەستە بەرەو بینای پاسەوانی وەڕێ کەوتن. زیندانییەکان بێگومان قسەی سەردەستەیان بە هێند دەگرت، بەڵام لەو گرینگتر قسەی پاسەوانەکان بوو کە قسەیان وەک یاسا وا بوو. ئەگەر درەنگ گەیشتبایەی ناوەکەتیان دەنووسی و سلوولی تاکەکەسی چاوەڕێی دەکردی. بەردەم بینای پاسەوانی قەرەباڵغ بوو. هەموو لەوێ بوون. پێدەچوو دەستیان بە ژماردن کردبێ.

***

لە کاتی چوونە دەردا دوو جار دەیانژماردن. جارێک لە پشت دەروازە داخراوەکە و جارێکیش کە لە دەروازەکە رەت دەبوون. ئەگەر لە ژماردندا هەڵەیەک هەبا، لە دەرەوەی گۆڕەپانەکە سەرلەنوێ دەیانژماردنەوە.

ئەو شفتە سەگ تێرپیاوە بنەی نەدەهات. سەردەستە دەستی راوەشاند و گوتی: «رۆی بکە سەر دیوار و لە کۆڵی کەوە.»

شۆخۆف گوتی: «تۆ بڕۆ قوربان، لەوێ بی باشترە.»

سەردەستە هەروا کە بە پلیکانەکاندا دادەگەڕا بە گاڵتەوە گوتی: «ئەو دەوید باوکانە بۆ وا زوو دەست لە کار هەڵدەگرن. پیاو تا دێ وەخۆ بکەوێ دەڵێین کات تەواوە.»

ئێستا تەنیا شۆخۆف و هاودەستە کەڕەکەی لەوێ مابوون. نەتدەتوانی زۆری قسە لەگەڵ بکەی بەڵام هەر پێویستیش نەبوو. کەس وەک سێنکا زیرەک نەبوو و بە ئاماژەیەک هەموو شتێکی دەخوێندەوە.

بە دەستێک شفتەی رادەخست و بە دەستەکەی دی کەرپووچی پێوە دەنووساند.

کەرپووچەکەی لە شوێنی خۆی دادەمەزراند و چاوێکی لێدەکرد! ئینجا هەر شفتەو هەر کەرپووچ، هەر شفتەو هەر کەرپووچ...

سەردەستە گوتبووی زگیان بە شفتەکە نەسووتێ. («رۆی بکە سەر دیوار و لە کۆڵی کەوە.») بەڵام شۆخۆف حەزی لەو جۆرە کارکردنە نەبوو. هەشت ساڵ بێگاریی ئۆردووگا نەیتوانیبوو خوورەوشتی بگۆڕێ. ئێستاش هەر کارێکی کردبای بە وردی و سەرنجەوە

دەیکرد. نەیدەتوانی خۆی بەوە رازی بکا کە شتێک خەسار بکا. شفتە، کەرپووچ، شفتە، کەرپووچ...

سێنکا قیژاندی: «بەسە، برۆ با تێی تەقێنین.»

زەنبەڵەکەی هەڵگرت و بە پلیکاناندا داگەڕا. بەڵام شۆخۆف چەند هەنگاو کشایەوە تا بۆ دواجار چاوێک بە دیوارەکەدا بخشێنێ. سەگ و پاسەوانەکانیش هاتبان، گوێی پێ نەدەبزووت. ئێی، خراپ نەبوو. بە چەپ و راستدا سێرەی لە دیوارەکە دەگرت. چاوەکانی وەک تەراز وا بوون. دیوارەکە مووی لێنەدەدا. دەست و بازووی هێشتا دەرەقەتی کارکردن دەهاتن. بە پەلە بە پلیکانەکاندا داگەڕا. سێنکا لە نێوەڕاستی پلیکانەکان بوو. ئاوڕی دایەوە و گوتی: «خێرا کە، دەی.»

شۆخۆف بە دەست ئاماژەی بۆ کرد و گوتی: «تۆ برۆ، من دەتگەمێ.» ئینجا چووە ناو ژوورەکە. نەدەکرا کەمچەکەی هەروا لەوێ جێ بێڵێ. لەوانەبوو سبەی کارێکی دیکەیان پێ سپاردبا و لەوانەشبوو دەستەکەیان ناردبا کۆمەڵگای ئیشتراکی و تا شەش مانگی دی نەهاتبانەوە وێستگە. ئەودەم چاوی بە ماڵنجەکەی نەدەکەوتەوە. کەواتە دەبوو لە شوێنێکدا حەشاری بدا. هەرتک سۆبەیان کوژاندبوونەوە. ژوورەکە تاریک و نووتەک بوو، ترسی لێ نیشتبوو. لە تاریکی نەدەترسا. بەتەنێ بەجێمابوو و لەوە دەترسا کە نەتوانێ لە وەختی خۆیدا خۆی بگەیەنێتە دەروازە و پاسەوانەکان تەقەی لێبکەن.

بە دەستەکوتە گەڕا تا لە قولینچکێکی خانووەکەدا بەردێکی دیتەوە. ماڵەکەی دەوێ نا و بەردەی لە جێی خۆی دانایەوە. دڵی ئاسوودە بوو.

دەبوو تا زووە خۆی بگەیەنێتەوە سێنکا. سێنکا سەد هەنگاوێ زیاتر لەوێ دوور نەببۆوە و چاوەنۆڕی بوو. سێنکا برادەری نیوەی رێیە نەبوو. لەتەنگانەدا پیاوی بەجێ نەدەهێشت.

***

لەو دنیایەدا کەسانی وا هەن بە هیچ و خۆڕایی بە دەوری یاریگادا پێشبڕکێ دەکەن. ئەو سەگبابانە بۆ نایەن پاشی رۆژە کارێک، کە نەیانتوانیبێ پشتی خۆیان راست بکەنەوە، بە دەستکێشی ئارەقاوی و چەکمەی شڕەوە بەو سەرما و شەختەیە پێکەوە پێشبڕکێ بکەن؟

پشوویان سوار ببوو.



سەردەستە لە پاژگابوو و بێگومان بە شێوەیەک دەستەکەی خۆی دەپەڕاندەوە. ئێستا گەیشتبوونێ و یەکسەر خۆیان بە ناو ئاپۆرەکەدا کرد.

سەد گەروو وێکڕا بە سەریاندا قیژاندن: «حەرامزادەی پۆخڵ! قەحپە دایک!» ئەو هەموو خەڵکە لە پڕێکا بەسەر پیاودا بقیژێنن، زەندەقی دەبەن. بەڵام زیاتر زەندەقیان لە پاسەوانەکان چووبوو کە دەبێ چیان لێ بکەن؟

وا دیار بوو پاسەوانەکان گونیشیان پێناچێ. تووشی تیۆرین بوون، دەبوو قسەیەکی لێکردبا و بە جەماوەرەکەی گوتبا کە درەنگ هاتنەکەیان خەتای ئەو بووە.

ئەوان هەروا دەیانگوڕاند، تەنانەت سێنکاش بەو گوێ گرانانەیەوە گوێی لە هات و هاواریان دەبوو. پەشۆکابوو، ئەویش بە سەریدا دەنەڕاندن. پیاوێکی وا کە تا ئێستا کەس گوێی لە دەنگی نەببوو، بستێکی زمان دەرکێشابوو. دەستی کردبوونە کۆڵەمست، رایدەوەشاندن و لەوە بوو ئانگژایان بێ. پاشان هەراو هوریایەکە بڕایەوە و هێندێکیان دەستیان بە پێکەنین کرد.

زیندانییەک بە دەنگی بەرز گوتی: «کورینە، ئێمە واماندەزانی ئەوهە بەڕاستی گوێی گرانە، تەنیا ویستمان تاقی بکەینەوە.»

هەموویان پێکەنین، تەنانەت پاسەوانەکانیش.

«بە پێنج ریز!»

دەروازەکە گاڵە درابوو. پاسەوانەکان هێشتا بۆ ژماردن نەهاتبوون. پاڵیان بە جەماوەرەکەوە دەنا. (هەموو مرشتەیان کردبووە پشت دەرگا، ئەو جاشکەکەرانە پێیان وابوو ئاوا زووتر دەتوانن بچنە دەرێ.)

«بە پێنج ڕ-ی-ز!»

هەموو جارێ کە ئەو دەنگە دەهات، زیندانییەکان پێنج پێنج، چەند هەنگاو دەچوونە پێشەوە.

شۆخۆف ئێستا پشوویەکی هاتبۆوە بەر و تەماشای ئاسمانی دەکرد. مانگ هەڵاتبوو و رەنگی مەیلەو ئەرخەوانی بوو. لەوانەبوو لە شەوی چواردە لایدابێ، کەت ببوو. رۆژی پێشوو هەر لەو کاتەدا کەمێک پتر هەڵکشابوو.

شۆخۆف کە لە مەترسییەکە دەرباز ببوون، دڵی خۆش بوو. ئانیشکێکی لە خاڵیگەی گەمیەوان کوتا و بۆ قەشمەری پێی گوت: «گەمیەوان ئەو کتێبانەی خوێندووتن، چییان لەبارەی ئەو شەوانەوە نووسیوە کە مانگ بەدەرەوە نییە؟ مانگ دەچێتە کوێ؟»

«مانای چی دەچێتە کوێ؟ گێلە، مانگ ناچێتە هیچ جێیەک، تۆ نایبینی.»

شۆخۆف سەری راوەشاند و پێکەنی: «باشە کە مرۆ نایبینێ، بەچی دیارە هەیە.»

گەمیەوان بە واق ورمانەوە گوتی: «ئەدی پێت وایە هەر بە چوار حەفتە جارێک، مانگێکی نوێ دێتە ئاسمان؟»

«بەڵێ وایە. کاتێ هەموو رۆژێ مرۆی نوێ دێنە دنیا، بۆ نابێ بەچوار حەفتە جارێک مانگێکی نوێ بێتە ئاسمان؟»

گەمیەوان بە تووڕەیی گوتی: «لێی وەبڕە، قەتم مەلەوانی وەک تۆ گێل و دەبەنگ نەدیوە. ئەدی مانگە کۆنەکە چی لێدێ؟»

شۆخۆف گوتی: «ئێ، منیش دەمەوێ ئەوە بزانم.» زەردەخەنەیەکی هاتێ و کەلێنی ددانانی دەرکەوت.

«باشە تۆ پێم بڵێ چی لێدێ؟»

شۆخۆف هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەو تەرە تەرە سەمەرەیەی خۆیەوە گوتی: «خەڵکی لای ئێمە دەڵێن خوا مانگە کۆنەکە ورد دەکاو ئەستێرانی لێ دروست دەکا.»

گەمیەوان گوتی: «سەلا لە ئەقڵتان.» ئینجا پێکەنی. «ئەوەم قەت نەبیستبوو. کەواتە تۆ بڕوات بە خوا هەیە، شۆخۆف؟»

شۆخۆف گوتی: «بۆ بڕوام پێنەبێ؟ کە لەو ئاسمانەدا دەگرمێنێ، کێ هەیە بڕوای پێنەیەنێ؟»

«خوا بۆ ئەو کارە دەکا؟»

«چ دەکا؟»

«مانگ ورد دەکا و ئەستێرەی لێ دروست دەکا؟»



شۆخۆف شانی هەڵتەکاندن و گوتی: «تۆ نەتدیوە جار نا جارێک، ئەستێرەیێ لە ئاسمان بەردەبێتەوە سەر زەوی. دەبێ جێگای ئەوانە بە ئەستێرەی نوێ پڕ بکرێنەوە.»

***

پاسەوانەکان کردیانە هەرا: «هۆی دایک حیز! لەوێ لاکەوە، بڕۆ نێو ریزەکەوە!»

ئەو پاسەوانەی دەیژماردن گەیشتە ئەوان. گەمیەوان و شۆخۆف لە دواوەی ریزەکە بوون.

پاسەوانەکان سەریان لێشێوابوو و لەو تەختانەیان دەنۆڕی کە لیستی ناوەکانیان لێ نووسیبوون. یەک کەم بوو! ئەوە جاری یەکەم نەبوو کەمیان دێنا. کەنگێ فێری ئەو کارە دەبوون.

چوارسەد و شەست و دوو زیندانییان ژماردبوون، کە دەبوو چوارسەد و شەست و سێ زیندانی بن.

زیندانییەکانیان لە پشت دەروازە رەپاڵ نان (دیسان هرووژمیان کردبۆوە پشت دەروازە) سەر لەنوێ دەستیان بە ژماردن کردەوە:

«بە پێنج ریز! یەک، دوو...!» ئەو دووپاتەکارییانە تەنیا وەختی زیندانییەکانی بە فیڕۆ دەدا. ئەوە لە حاڵێکدا بوو تا ئۆردووگا رێگایەکی دوور و درێژیان لەبەر بوو و لەوێش دیسان بۆ پشکنین ریز دەبوونەوە. زیندانییەکان لە هەموو کارگەکانڕا پەلەیان بوو تا زووە خۆیان بگەیەننەوە ئۆردووگا. ئەوانەی پێش هەمووان گەیشتبانەوە ئۆردووگا، بە باشی بە کارەکانیان رادەگەیشتن. خواردنگە دەربەست هی خۆیان بوو. ئەگەر شتیان بۆ هاتبا، یەکەم کەس وەریاندەگرت. بەر لە هەمووان سەردانی چێشتخانەیان دەکرد و چێشتی خۆیان لێدەنا. نامەی خزم و کەسیان وەردەگرتن، یا ئەو نامانەی نووسیبوویانن، دەیاندانە بەشی پشکنینی نامان. دەچوونە سەرتاشخانە و دەرمانخانە و حەمام و، بەکورتی هەموو دەرگایەکیان بۆ لەسەر پشت بوو.

***

پاسەوانەکانیش پێیان خۆش نەبوو درەنگ بگەنەوە ئۆردووگا. ئەوانیش تووشی چەرمەسەری دەهاتن. گەلێ کاریان هەبوو کە دەبوایە بیکەن و ئیتر کاتی ئەوەیان بۆ نەدەمایەوە بە خۆیان رابگەن.

دیسـان لە ژماردندا بە هەڵە چووبوون. کە دوایین ریزیان دەژمارد شۆخۆف پێی وابوو ئیتر تەواو بـوو، بەڵام ئەو بە نەعلەت بـووە دیسـان شـەست و دوو کـەس بوو. ئێـشکگرەکـان بەخۆو تەختەی دەستیانەوە چوونە لای ئەفسەری پاسەوان و راپۆرتیان دایە.

ئەفسەری پاسەوان هاواری کرد: «سەردەستەی سەدو چوار!»

تیۆرین نیو هەنگاو چووە پێشەوە و گوتی: «لێرەم!»

«کەسی دەستەکەی تۆ لە وێستگەی کارەبا ماوە؟ چاک بڕوانە!»

«نەء.»

«هۆش و گۆشت وە کار بخە! دەنا مێشکت دەپژێنمە ناو دەمت...»

«گوتم: نەء.»

تیـۆرین لای کـردەوە و سـەیری پاڤلۆی کـرد. رەنگە یەکـێک لەوێ خـەوی لێکەوتبێ. ئەفسەری پاسەوان نەڕاندی: «دەستەکان بە جیا ریز بن!»

هەمـوویان پێکەوە بە پێنج ریز وەسـتـابوون. زەنا زەنایەک کـەوتە نێـو زینـدانیـیـەکـان. یەکتریان پاڵ پێوەدەنا و هاواریان دەکرد: «حەفتـاو شەش لێرەیە»، «سێزدە ئەوەتانێ!»، «سی و دوو وەرە ئێرە!»

ئەندامانی دەستەی سەد و چوار هەر لەو شوێنەی لێی راوەستابوون، لە پاش دەستەکانی تر ریز بوون. شـۆخـۆف چاوی لێکرد زۆربەی ئەفـرادی دەسـتـە دەست لە گـونان بەرەژێر هاتوونەوە. سەگبابی بێ مشوور لە بیریان کردبوو داران وەخرکەن. تەنیا دوو کەس چەند سەرەدار و لەتە تەختەیان پێ بوون.

هەمـوو رۆژێ ئەو گەمـەیە بوو. بەر لە تەواوبوونی کـار، زینـدانیـیـەکـان کـوتە داریان خڕ دەکردنەوە، بە کەندر یان داوە بەنێک شەتەکیـان دەدان و دەیانبـردنەوە ئۆردووگا. ئەگەر سەرپەرشتیـاری کارگە یان سەرکـارگەرێک هاتبا پێش دەروازە، بۆ ئەوەی بەر لە بردنی داران بگرن، مرۆیان دەپشکنی. ئەوە خانی یەکەم بوو. هەچ داری پێت با دەبوو هەڵیرێژیە سەر زەوی. (بە ملیـۆنان داریـان ئاگـر پێـوە دەنا و دەیانسـووتاند، کـەچی لەو چەند کـوتە دارەیان دەپێـچـایەوە). بەڵام زینـدانیـیـەکـان وایان لێک دەدایەوە ئەگـەر هەر کـام



تەڵاشـەدارێکی گـچکەش لەگـەڵ خـۆیان بێننەوە، شـەوانە خـەوگـە باشـتـر گـەرم دادێ. خزمـەتکارەکان بۆ هەر سۆبەیەک تەنیا پێنج کیلۆیان وردە رەژی دێناو ئەوەندەش بۆ گەرم داهێنانی خەوگە بەشی هیـچی نەدەکرد. بۆیە دارەکانیان قەڵتوبڕ دەکردن بۆ ئەوەی بتوانن دەبن شاقەلی پاڵتۆدا بیانشارنەوە و لە دەروازەیان رەت بکەن.

پاسـەوانەکـان لە کـارگـا قـەت بە زینـدانیـیـان نەدەگـوت دارەکـان هەڵبـڕێژێ. ئەوانیش حەوجەیان بە دار بوو، بەڵام خۆیان بۆیان نەبوو دار لە کارگە وەدەر بخەن. لەبەر دوو هۆ، یەکـەم چونکە بەرگـی سـەربازیـیـان لەبەردابوو، دووەم لەبەر ئەوەی دەبوو هەردووک دەستـیـان ئازاد بن بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستـدا تفەنگ رووەو زینـدانی بگرن. بەڵام هەر کە دەگەیشـتنەوە ئۆردووگا مەسەلەکە دەگۆڕا و شەکر شکاندنیـان دەستی پێدەکردەوە: «فلان ریز، فیساره ریز، دارەکان دانێن!» بەڵام زۆریش بێ ئینساف نەبوون. هێندێکیان لەدارەکـان دەبرد و هەندێکیـشیـان بـۆ بەجێ دەهێـشتن، ئەگـەر داریشـیـان پێنەبا، ئەوە کێشەکە دەبڕایەوە.

بەم جۆرە هەمـوو رۆژێ هەر زینـدانییەو بڕێکی دار لەگەڵ خۆی دەبردەوە. دڵنیـاش نەبوو بتوانێ لە دەروازەی بپەڕێنێتەوە، یان کەی و لە کوێ پاسەوانەکان دەگەنە سەری.

لەم کاتەدا شۆخۆف لە دەوروبەری خۆی روانی تا ئەگەر کوتە دارێکی لێبێ، بیقاچێنێ. سەردەسـتـە تا دوامین کەس ژمـاردنی و بە سـەرپاسـەوانی گوت: «دەسـتـەی سەد و چوار هەموو لێرەن.»

سیزاریش لە نووسینگە هاتبووە دەرێ و لە ناو ریزەکەدابوو. ئەو سەبیلەیەی مژی لێدەدا، بە ئاگرێکی سوور داییسا، سمێڵەکانی چلوورەیان بەستبوو. لە گەمیەوانی پرسی: «ئێ، وەزعەکە چۆنە، گەمیەوان؟»

ئەگـەر لە باتی ئەو ژووره گـەرمـوگـوڕە لە نـاو سەرماو سـۆڵدا تەزیبـا، قـەت پرسـیـاری وا گەوجانەی نەدەکرد. گەمیەوان شانی هەڵتەکاندن و گوتی: «وەزع چۆنە؟ قەبەزەی پشتم ئەوە دەشکێ و بە زۆر خۆم بەسەر پێوە گرتووە.» دەتگوت دەیەوێ سیزار تێبگەیەنێ کە بۆ مژێک لەو سەبیلەیەی خەریکە سوێی دەبێتەوە.

سیـزار سەبیلەکەی وێ دا. گەمیـەوان تاقەکەس بوو کە سیـزار خۆشی دەویست. لەگەڵ شتاق لە زیندانییەکان ئاوا خۆمانە و گەرموگوڕ نەبوو.

نهۆ تێکرا بە دەنگی بەرز دەیانگوت: «زەلامێکی دەستەی سی و دوو نەهاتووە! زەلامێکی دەستەی سی و دوو!»

یاریدەدەری دەستەی سی و دوو لەگەڵ زیندانییەکی تری هەمان دەستە بەغار بەرەو تەعمیرگا وەڕێ کەوتن. هەموویان لێکتریان دەپرسی کێ دیار نییە؟ مەسەلە چییە؟ شۆخۆف بەرگوێی کەوت کە یەکێ لە مولداوییەکان، ئەوی سەرڕەش و خڕیلە، بزر بووە. بەڵام خۆ هەردووکیان کورتەبنە و ڕەشتاڵە بوون. دەبێ هەر ئەوەیان بێ کە لە قسان، سیخوڕی ڕۆمانیا بووە؟

هەر دەستەیەک پێنج سیخوڕی لەگەڵ بوون، بەڵام ئەو تاوانەی خرابووە پاڵ ئەمانە درۆی پەتی بوو. تاوانیان هەر ئەوە بوو کە دوژمن بە دیلی گرتبوون. شۆخۆفیش بە یەکێ لەو سیخوڕانە لەقەڵەم دەدرا.

بەڵام ئەو مولداوییە سیخوڕی ڕاستەقینە بوو. ئەفسەری پاسەوان چاوی لە کاغەزی لیستی زیندانییەکان کرد و ڕووی خۆی گرژ کرد. ئەگەر سیخوڕێکی لە دەست دەرچووبێ بەبێ ئەملاوئەولا دەبوو خۆی شوێنەکەی بگرێتەوە.

شۆخۆفیش وەک هەمووان شێتگیر ببوو. سەگبابە پێی وابوو کێیە؟ سەرمازەڵەی تەرەسی قوڕمساغ، زۆڵی گەواد!

وڵات تاریک داهاتبوو، مانگ هەڵکشابوو. ئەستێرە دەرکەوتبوون. سەرمای شەو بێ ئامان بوو، سەیر لەوەدایە ئەو سەگبابە لەو کاتەدا خۆی بزر کردبوو. ئاخر ڕۆژێک کار، یازدە سەعات، لە بەری بەیانەوە تا نوێژی شێوان بەس نەبوو بۆی؟ دە لێی گەڕێ کوێی پێ باشە با لەوێ بێ و پاشان با خۆ ئامادە کا بۆ زەبروزەنگی کاربەدەستانی دادگا.

مرۆ چۆن دوای ڕۆژێک کوێرەوەری و قوون هەڵدڕان گوێی لە فیتەی دەست هەڵگرتن نابێ؟

شۆخۆف هیچ وە بیری نەمابوو کە بۆ خۆشی تا نیو کاتژمێر لەمەوبەر دڵی لە کارەکە بەر نەدەبوو و پێی ناخۆش بوو ئەوانی دی وا زوو لەپێش پازگا خڕ بوونەتەوە. ئێستا ئەویش لەو تۆف و بەندەدا چاوەنۆڕ بوو و وەک هەمووان ئەوی بە زاریدا هاتبا نەیدەگێڕایەوە. خوام لەو خوایەیە ئەو مولداوییە نیو سەعاتی دیکەیان ماتڵ دەکا! شۆخۆف بیری



لێکردەوە ئەگەر پاسەوانەکان ئەو حەرامزادە سەگبابەیان بدابایە بەر دەست، وەک گورگ هەڵا هەڵایان دەکرد.

سەرما دەگەیشتە هێسکی مرۆ. کەس خۆی لەبەر ڕانەدەگرت. قاچیان لە عەرزی دەکوتا، یان ڕاوێچکەیان دەکرد.

ئی وابوو دەیپرسی ئەرێ ئەو مولداوییە دەبێ رایکردبێتە کوێ؟ ئەگەر ڕۆژ با، دیسان باشتر بوو. بەڵام ئەگەر نووکە خۆی مەڵاس دابێ و چاوەڕوانی چۆڵکردنی بورجەکانی پاسەوانی بێ، هیچ ڕێگای دەرباز بوونی نییە.. ئێشکگرەکان تا نەیاندۆزیبایەوە بورجەکانیان چۆڵ نەدەکردن. ئەگەر سێ ڕۆژیشی پێچووبا، تا دڵنیا نەببان لە تێلبەندەکان هەڵتڵە بووە، ئەو ناوەیان جێنەدەهێشت و تەنانەت لەوانەبوو تا حەفتەیەکیش لە دووی گەڕابان. ئەوە حوکمی یاسا بوو و هەموو کۆنە زیندانییەک دەیزانی. ئەگەر زیندانییەک رایکردبا، پاسەوانەکان پێیەوە چارەڕەش دەبوون. خوردو خەویان لە خۆ حەرام دەکرد تا دەیاندۆزیەوە، ئەوجا مەحاڵ بوو بێڵن زیندانییەکە بە زیندوویی بگاتەوە ئۆردووگا.

***

سیزار و گەمیەوان دەمەتەقەیان بوو: «بۆ وێنە، ئەو دیمەنەت وەبیرە کە چاویلکەکەی بەلایەکدا دەردێنا؟»

گەمیەوان بەدەم کێشانی سەبیلەوە گوتی: «ئم م م.»

«یان ئەو دیمەنەی کە فایتوونی منداڵەکە بە پلیکانەکاندا دەهاتە خوارێ؟»

«بەڵێ... بەڵام دیمەنەکانی سەر پاپۆڕ زۆر دەسکرد دیارن.»

«ئێ، ڕەنگە لە بەر شێوازی نوێی نومای درشت بێ.»

«بەڵێ، ئەو کرمانەش کە لەسەر گۆشتەکە لێک دەئاڵان، بەقەد کرمە سوورە گەورە نیشان دەدران. لە ڕاستیدا ئەو کرمانە زل نین، وا نییە؟»

«بەڵام ناکرێ ئەو جۆرە شتانە لەسەر پەردەی سینەما بچووک نیشان بدرێن.»

«هەر ئەوەندە دەڵێم خۆزگە ئەو گۆشتەیان دێنایە ئۆردووگا و لە جیاتی ئەو ماسییە رزیوانە بۆیان لە خواردنەکە دەکردین. مەرج دەکەم...»

زیندانییەکان هاواریان لێهەستا: «هەهانێ!»

تارمایی سێ پیاوان دیار بوو کە لە تەعمیرگاوە دەگەڕانەوە. دیار بوو مۆلداوییەکەیان دۆزیبۆوە.

جەماوەرەکە لە پێش دەروازە دەیانگوڕاند. کە ئەوان نزیک بوونەوە بە جنێوان دایگژانێ.

«زۆڵی تەرەس، ژن حیزی بوودەڵە! خوێڕی!»

شۆخۆفیش وێڕای ئەوان ملی لێنا.

راگرتنی پێنسەد کەس لەبەر ئەو ساردو سەرمایە، گەمە نەبوو. مولداوییەکە ملی حیز کردبوو و دەهاتە پێش. دەتگوت فەرخە مشکە.

یەکێ لە پاسەوانەکان نەڕاندی: «بوەستە!» ئینجا شتێکی لە دەفتەری بەرباخەڵی نووسی. «ک ٤٠٤، تائێستا لە کوێ بووی؟»

گرووبانی پاسەوان لە حاڵێکدا کە رووی چەکەکەی لە مۆلداوییەکە کردبوو، لێی چووە پێشەوە. لەناو خەڵکەکەدا هێندێکیان هێشتا جنێویان دەدا: «رەشەوڵاخ، بیژی، کەران بابگاو!» بەڵام ئەوانی تر کە پاسەوانەکەیان دی چەکی راکێشاوە، بێدەنگ بوون.

مۆلداوییەکە سەری شۆڕ کردبوو، زمانی نەدەگەڕا. کە پاسەوانەکە لێی چووە پێشێ، پاشەوپاش کشایەوە.

یاریدەدەری دەستەی سی و دوو چووە پێشەوە، گوتی: «ئەو بێشەرەفە، چووبووە سەر داربەست، دیوار سواغ بکا. پێی وابوو دەستی منی ناگاتێ! لەوێ گەرم داهاتبوو و خەوی لێکەوتبوو.»

مستەکوڵەیەکی لە پشت ملی راکێشاو لە پاسەوانەکەی دوور خستەوە. مۆلداوییەکە پاشەوپاش کشایەوە و لەوکاتەدا یەکێ لە هاودەستەیەکانی، کابرایەکی مەجاری، ئامبازی بوو شاپێکی دە پشتی هەڵدا.



بێگاری ئۆردووگا لەگەڵ سیخوڕی زۆر جیاواز بوو. هەموو گەمژەیەک لە دەستی دێ سیخوڕی بکا. کایەیەکی سەیرو سەمەرە و سەربەگۆبەندە. بەڵام سیخوڕی لە کوێ و دە ساڵ خاکەساریی ئۆردووگا لە کوێ؟

پاسەوان لوولەی چەکەکەی شۆڕ کردەوە. ئەفسەری پاسەوان نەڕاندی: «لەپشت دەروازە لاکەون. هەموو بە پێنج ریز!»

دیار بوو ئەو سەگە هارانە جارێکی تریش دەیانژمێرنەوە. ئاخر ژماردنەوەی بۆ چ بوو؟ ئەدی هەموو لەوێ نەبوون؟ زیندانییەکان وە بۆڵەبۆڵ کەوتن. ئێستا مۆلداوییەکەیان لە بیر کردبوو و رکیان لە پاسەوانەکان هەستابوو. کەس لە جێی خۆی نەدەبزووت.

سەرپاسەوان نەڕاندی «ها..؟ چی؟ دەتانەوێ لێرە لە ناو ئەو بەفرەدا بتۆپن؟ قەی ناکا، تا بەیانی دەبێ لێرە بن!» بێگومان ئەو کارەی لەدەست دەهات و ئەگەر کەیفی لێبایە، کەس نەبوو قسە لە قسەی بکا. ئەوە کاری ئەورۆ و دوێنێی نەبوو. جار هەبوو چۆکیان بە زیندانییەکان دادابوو و پاسەوانەکانیش لوولەی چەکیان تێکردبوون. زیندانییەکان ئەو کابرایەیان چاک دەناسی، بۆیە پێش دەروازەکەیان بەردا. نەڕەی پاسەوانێک هات: «بکشێنەوە! بکشێنەوە!» زیندانییەکان هەروا کە دەکشانەوە، ئەوانی دواوە بە سەر کەسانی پێش خۆیاندا دەقیژاند: «بۆ واتان هرووژم کردۆتە دەروازە، زۆڵینە؟» لە داخی کەسانی پێشەوە دەهری ببوون، چشیان لە دەست نەدەهات؟

«بە پێنج ریز!»

مانگی پڕ، تریفەی دەپڕژاند. ئیتر ئەو رەنگۆکە ئەرخەوانییەی نەمابوو و هەروا پتر هەڵدەکشا. سەری شەوەکەیان لە دەست چووبوو. هەی گوو بە گۆڕی بابت، مۆلداوی! گوو بە گۆڕی بابی ئێوەش، پاسەوانینە! هەی ئەو ژینەش سەگی تێڕی!

کەسانی پێشەوە کە ژمێردرابوون، لایان دەکردەوە، دەهاتنە سەر پەنجەی پێیان و چاویان لە کۆتایی ریزەکە دەکرد. ئاخۆ کە پاسەوانەکان دەگەیشتنە ریزی دواوە، ژمارەکە دەبووە چەند؟ شەست و دوو یان شەست و سێ؟ ژیان و مردنیان بەو دوو ژمارەیەوە بەند بوو.

شۆخۆف وای هاتە بەرچاو کە دوا ریز، چوار کەسن. لە ترسان گێژو کاس بوو. یەک زیاد بوایە سەرلەنوێ دەستیان بە ژماردن دەکردەوە، بەڵام ئەو یەک کەسە فتیۆکۆفی شڕەخۆر بوو کە چووبوو لەوێ جغارە هەڵبگرێتەوە و نەگەڕابۆوە شوێنی خۆی.

یاریدەدەری سەرپاسەوان شەپا زللەیەکی لە پاش ئەستۆی سرەواند. وەی نۆشی گیانی بێ! لەبەر دەستی مرم! ئێستا دوامین ریز بوونەوە سێ کەس. ژمارەیان تەواو بوو. ئۆخەی!

پاسەوانەکان هەروا دەیانقیژاند: «لەبەر دەروازە لاکەون!»

ئەوجارە کەس نەیدەبۆڵاند. چەند سەرباز لە پازگا هاتنە دەرێ و لەپشت دەروازەکە کۆزیلکەیان کرد.

کەوابوو ئێستا دەیانبردنە دەر.

سەرپەرشتیاری کارگا و سەرکارگەرەکان سەرو سۆراخیان دیار نەبوو. ئەوان کرێکاری ئازاد بوون. بۆیە دەیانتوانی دار و تەختانیش دەگەڵ خۆیان بەرنە دەرێ.

دەروازە کرایەوە و سەرپاسەوان و موفەتیشێک لەودیوی دەروازە لە پشت پەرژینەکە راوەستان. ئەفسەری پاسەوان گوڕاندی:

«یەک، دوو، سێ...»

ئەگەر ئەوجاریش ژماردنەکە هەڵەی تێنەکەوتبا، ئێشکگرەکانیان لە بورجی پاسەوانی دێنانە خوارێ، هەتا ئەوانیش لەو بورجانەوە دەگەیشتنە دەروازە، زیندانییەکان وەزگیان دەدا. تا دوایین زیندانی نەچووبا دەرێ، بە ئێشکگرەکانیان نەدەگوت بورجەکان چۆڵ بکەن. سەرپاسەوان ئەگەر هەر تۆسقاڵێکی ئاوەز هەبا دەمودەست فەرمانی وەڕێ کەوتنی دەدا. ئاخر دەیزانی کە هیچ رێگای راکردنیان نییەو پاسەوانی بورجەکانیش دەگەیشتنێ.

بەڵام ئەگەر ئەفسەری پاسەوان دەبەنگ با، دەترسا بۆ پاراستنی زیندانییەکان پاسەوانی کەم بن، بۆیە چاوەڕوان دەما تا ئێشکگرەکانی بورجی دیدەوانیش بگەنە کن دەروازە. ئەوڕۆ نۆرەی جاشکە کەرێکی وابوو و، دەبوو جارێ لەوێ راوەستن.

نزیکەی کاتژمێریک بوو لەسەر لاق راوەستابوون. ئەوەندەی خەمی لە دەستچوونی دەرفەتی سەری شەویان بوو، هێندە بەو سەرمایە قەڵس نەبوون. کە دەگەیشتنەوە ئۆردووگا وەختی هیچ کارێکیان بۆ نەدەمایەوە.

یەکێک لە ریزی تەنیشتەوە لە گەمیەوانی پرسی: «ئەو حەمکە زانیارییەت لە مەڕ هێزی دەریاوانی ئینگلستان چۆن وەگیر کەوتووە؟»



«دەزانی چۆن؟ من مانگێکی رەبەق لەسەر کەشتییەکی شەڕکەری ئینگلیزی بووم. بۆ خۆم کابینی تایبەتیم هەبوو. وەکو ئەفسەری پەیوەندییەکان لەتەک ئینگلیز کارم دەکرد. دوای شەڕ دەریاوانێکی ئینگلستان دیارییەکی بچووک و یادداشتێکی پێزانینی بۆ ناردم. بەڕاستی شێتگیر ببووم و هەرچی بەزارمدا هاتبا نەمدەگێڕایەوە. بەو جۆرە کەوتمە قۆرت و ئێستا دەبێ لەگەڵ دارودەستەی «بەندرا» دا هەڵکەم.»

***

دیمەنێکی سەمەرە بوو. دەشتێکی کاکی بەکاکی و تەختان، گۆڕەپانی رووتوقووتی کارگە و، تریفەی مانگەشەو لەسەر بەفر. پاسەوانەکان چووبوونە شوێنی خۆیان. بە مەودای دە میتر لێکتر دوور و، چەکەکانیان لە سەرپێ بوون. لەنێو ئەو رەوەدە بۆرەی زیندانییاندا، ئەویش، زیندانیی ژمارە س-٣١١، بەو جلە رەشەوە وەک هەمووان چاوەنۆڕ بوو. پیاوێکی وا کە سەردەمێک خاوەنی سەرشانی رەنگ زێڕین بوو و نەردی دۆستایەتی بە دەریاوانی ئینگلیزی دۆڕاندبوو، ئێستا دەبوو لەگەڵ فتیۆکۆف زەنبەڵ بکێشێ.

کەس دەرباز نەدەبوو...

***

پاسەوانەکان هەموو هاتبوون. ئەوجارە تەشریفاتیان کەم کردەوە.

«بە هەنگاوی توند و خێرا، بۆ پێشەوە!»

ناماقووڵیان کرد! ئێستاکە پاشی هەمووان دەگەیشتنەوە ئۆردووگا، هەنگاوی توند و خێرا لە پای چی؟ زیندانییەکان بێ ئەوەی یەک وشە پێکەوە بدوێن، دەیانزانی دەبێ تۆڵەی خۆیان بکەنەوە. («ئێوە گەلێکتان ماتڵ کردین، ئێستا سووڕی ئێمەیە. با بزانین کێ بۆ جێگا گەرم و نەرمەکەی بە تاڵووکەیە!»)

سەرپاسەوان نەڕاندی: «وەڕێ کەوە، ریزی یەکەم، وەڕێ کەوە!»

دەبوو بە خەون بیبینن! زیندانییەکان سەریان دەبەر خۆیان نابوو، دەتگوت تەرمیان پێیە. تازە کەوڵەکە ئاو بردبووی. ئەوان دوایین دەستە بوون دەچوونەوە ئۆردووگا. ئەو پاسەوانانە کە ئەوی ویژدان و بەزەیی بێ نیانە، هەتا دەقەڵشن با لە خۆ بنووسێن.

سەرپاسەوان هەر چەند قیژاندی بێ کەڵک بوو. زیندانییەکان هەروا بە کاوەخۆ دەڕۆیشتن. پاسەوانەکانی دیکەش چیان پێنەدەکرا. زیندانییەکان بە پێی ئەم بە پێنج ریز دەڕۆیشتن. سەرپاسەوان مافی ئەوەی نەبوو بە زۆری وایان لێبکا خێراتر برۆن. (بەیانیان رۆیشتنی بە هێواشی، تەمەندرێژی بە مرۆ دەبەخشی. کەس بۆ گەیشتن بە شوێنی کار پەلەی نەبوو. تا پێیان کرابا بە خاوی هەنگاویان دەنا. هەرکەس وای نەکردبا لە نیوەی رێگا دەوەستا و پێش دەست پێکردنی کاری رۆژانە لە لاق دەپەڕی و زەحمەت بوو بە ساغی لە ئۆردووگا بچێتە دەرێ.)

قەتاری زیندانییەکان بە لۆژە لۆژ دەڕۆیی و تەنیا کرپەی بەفر لە ژێر چەکمەکانیان دەبیسترا. هێندێکیان یەک دوو قسەیان پێکەوە کرد، دەنا زۆربەی زۆریان تاقەتی قسەکردنیان نەبوو. شۆخۆف بیری لەوە دەکردەوە، ئەمرۆ بەیانی لە ئۆردووگا چ کارێکی هەبووە. هاتەوە یادی، سەردانی دەرمانگا! سەیرە، لە کاتی کارکردندا هیچ بە بیری نەمابوو.

ئێستا جەنگەی سەردانی دەرمانگا بوو. ئەگەر زوو شێفی خواردبا، دەیتوانی بچێ، بەڵام ئیتر پشتی چاک ببۆوە. دەتگوت قەت تای لێ نەبووە. چوونە دەرمانگا تەنیا وەختی لێ دەکوشت. بە بێ چارەسەریی دکتۆریش چاک دەبۆوە. ئەوانەی لە دەرمانگا بوون لە خەڵک ناردنە گۆڕستانان بەدەر، چیان لەدەست نەدەهات.

فکری دەرمانگای لە مێشکی خۆی وەدەرنا و بیری لەوە کردەوە چۆن خواردنێکی گەرم و نەرم بۆ شێف دەستەبەر بکا. هەموو ئاواتی ئەوە بوو سیزار شتی لە دەرێرا بۆ هاتبێ. لە مێژ بوو هیچی بۆ نەهاتبوو. ئێستا جەنگەی بوو.

***

لە پڕ لەناو ریزەکەدا شتێک قەوما. ریزەکان بەدوای یەکدا راکێشران و رێکوپێکی هەنگاوەکان تێکچوو. ریزەکە وەک قەڵەمبازێک باوێ وابوو. زیلە زیلێکی وەک گیزەی هەزاران پوورە هەنگ دەهات. زیندانییەکانی ریزی دواوە –کە شۆخۆفیشیان لەگەڵ بوو– ملیان لە غار نا تا بگەنەوە ئەوانی دی. کە گەیشتنە سەر تەپۆڵکەیەک و لێی تێپەڕین، شۆخۆف هەگەری ئەو قەڵەمبازە لە ناکاوەی بۆ دەرکەوت. لەوپەڕی پێدەشتەکە، قەتارێکی



تر، بە مەوداویەکی دوور لەوان، لابڕ بەرەو ئۆردووگا دەیئاژۆت. ئەفرادی ئەو قەتاریش ئەوانیان دیبوون و هەنگاویان گورجتر کردبوون.

ئەوان ئەو زیندانییانە بوون کە لە کارگەی کەرەستەسازی دەگەڕانەوە. سێسەد کەس دەبوون. دیارە ئەو بەدبەختانەش نەیانتوانیبوو لە کاتی خۆیدا بەڕێ بکەون. ئەوان ئاخۆ چیان بۆ هاتبێتە پێش؟ جار هەبوو رایان دەگرتن تا کاری چاککردنەوەی ئامێریک تەواو بکەن. کاری ئەوانە زۆریش ئەستەم نەبوو. بە درێژایی رۆژ لەو کارگایانەدا رایاندەبوارد و هیچ نەبێ جێگایان گەرم بوو.

ئێستا هەرکام ملەی بوو زووتر بگاتەوە. دەستیان بە غاردان کرد، پاسەوانەکانیش وێڕای ئەوان کەوتنە غار. سەرپاسەوان نەڕاندی: «ریزەکە تێک مەدە، ریزی دواوە، بچۆ پشت سەری کەسی پێش خۆت!»

ئەوجار چی دەویست؟ خۆ هەموویان لە پشت سەری کەسی پێشەوە بوون.

ئێستا کەس هۆشی لە خۆی نەمابوو، تەنیا لە بیری ئەوەدا بوون وەپێش قەتارەکەی دی بکەونەوە و زووتر بگەنەوە ئۆردووگا.

بوو بە کەرکەرێنێکی سەیر. هەموو شتێک شێوا. لەگەڵ پاسەوانەکان تێکەڵ ببوون. ئێستا تەنیا رقیان لە ئەفرادی قەتارەکەی دیکە دەبۆوە.

قەتارەکە رۆحی هاتبۆوە بەر. زیندانییەکان وەخۆ کەوتبوونەوە. کەسانی دواوە بەسەر ئەفرادی پێش خۆیاندا دەقیژاند: «برۆ دەی، خێراکە، پێ هەڵگرە!» قەتارەکە دوورونزیکی یەک لەو جادانە ببوو کە دەچوونەوە ئۆردووگا. قەتارەکەی تر لە پشت ریزە خانوویەک گیرا و نەدیو بوو.بەڵام هەروا خێرا دەڕۆیشتن.

گەیشتنە سەر جادەکە. رێکردن خۆشتر ببوو و پاسەوانەکانیش ئیتر ناچار نەبوون بە کەند و قۆرتاندا دوایان بکەون. ئالێرە، دەبوو وەپێش قەتارەکەی تر بکەونەوە.

لەبەر شتێکی دیکەش پێیان خۆش بوو وە پێشیان بکەونەوە. پشکنینی ئەو زیندانییانەی لە کارگەی کەرەستەسازی دەگەڕانەوە، پتری دەخایاند. مەسەلەی کوشتنی دوو سیخوڕەکان لە گۆڕێدا بوو. کاربەدەستان گەیشتبوونە ئەو ئەنجامە کە چەقۆیەکان لە

کارگەی کەرستەسازی دروست کراون و ئەوانەی لەوێ کار دەکەن هێناویاننەتەوە ئۆردووگا. بۆیە کە دەیانپشکنین، کونی چاویشیان دەگەڕان. ئاخروئۆخری پایز بوو-لەو دەمڕا ساردی دەکرد- پاسەوانەکان بە سەریاندا دەقیژاندن: «ئەفرادی کارگەی کەرستەسازی، چەکمان داکەنن! چەکمەکانتان بەدەستەوە بگرن!» ئینجا بە پێخواسی دەیانپشکنین.

ئێستا بەو سەرماو سۆڵە، بە ئاماژەی پاسەوانەکان تەنیا لینگێکی چەکمەکانیان دادەکەندن. «خێرا، دای کەنە! لینگی راستە! ئینجا تۆ! لینگی چەپەت!» ئەوانیش بە هەنگڵەشەلە، چەکمەکانیان سەراونخوون هەڵدەتەکاندن، هەتا پێپێچەکانیان بێنە دەرێ و دەرکەوێ کە چەقۆیان تێدانییە.

شۆخۆف بیستبووی -راست یان درۆ- پار هاوینێ ئەفرادی کارگەی کەرستەسازی، هێندێک تیرەگیان بۆ یاریگای والیبالّ هێنابوونەوە ئۆردووگا و چەقۆیان تێدا شاردبوونەوە. -هەر تیرەگەی «دە» چەقۆ- لەو کاتەوە ئەو چەقۆیانە دەستاودەست دەکەن.

***

بە لۆقاوی درێژ خانووی تازەی یانە (باشگاه)یان بەجێ هێشت. لە خانووی ماڵەکان و کارگەی دارتاشی تێپەڕین. گەیشتنە پێچێک کە لەوێ رێگاکە دەگەیشتە پازگا. زیندانییەکان کردیانە هەراو هوریا. ئێرە شوێنی تێکەڵبوونی دوو جادەکان بوو، کەواتە دەبوایە زووتر خۆیانی بگەیەننێ. زیندانییەکانی کارگەی کەرستەسازی دووسەد میترێ لە دواوەیان بوون. ئێستا دەیانتوانی هەناسەیەکی رەحەت هەڵکێشن. شاگەشکە ببوون. ئاکاریان لە هی ئەو کەروێشکانە دەچوو کە وەپێش رەوە کەروێشکێکی تر کەوتبنەوە.

گەیبوونەوە ئۆردووگا. هەوا هەروەک بەیانی کە هاتبوونە دەرێ تاریک و تنووک بوو. دەوراندەوری ئۆردووگا چرای لێ هەڵکرابوون. بەڵام شۆقی تیشکاوێژی سەر پازگا لە ئی هەموومان پتر بوو. ئەو شوێنەی موفەتیشەکانی لێبوون و چاوەڕێی زیندانییەکانیان دەکرد، وەک رۆژ رووناک بوو. هێشتا نەگەیشتبوونەوە دەروازەی ئۆردووگا کە یاریدەدەری سەرپاسەوان گوڕاندی: «راوەستن!» چەکەکەی وە یەک لە پاسەوانەکان دا و هاتە کن قەتاری زیندانییەکان. (بە چەکەوە زۆر لە زیندانییەکان نزیک نەدەبوونەوە.)



«ئەفرادی لای راست، کێ ئێزینگی پێیە، داینێ!»

زیندانییەکان ئێزینگیان نەدەشاردنەوە. تێلەکەی بچووکی داران، یەک بە دوای یەکدا دانرانە زەوی. هێندێکیان خەریک بوون دارەکان وە زیندانییەکانی ریزی نێوەڕاست بدەن، بەڵام ئەوانی دی لێیان وەجواب هاتن:

«هەڵیانرێژن، دەنا لە هەمووانمان دەستێنن، هەڵیانرێژن!»

خراپترین دوژمنی زیندانی کێ بوو؟ هەر ئەو زیندانییانەی لە پەنای راوەستابوون. ئەگەر وا نەبوایە حاڵیان بۆ ئەو حاڵە دەبوو؟

یاریدەدەری سەرپاسەوان نەڕاندی: «رێ، کەون!» زیندانییەکان بەرەو پازگا وەڕێ کەوتن.

لە پێش پازگا پێنج رێگا تێکەڵ دەبوونەوە. سەعاتێک لەمەوبەر جادەکان لەو زیندانییانە جمەیان دەهات کە لە کارگەکانی دیکەڕا گەڕابوونەوە.

کاتی خۆی ئەگەر ئەو جادانە تەواو ببان، گۆڕەپانی گەورەی ئەو شارۆچکەیەی سازیان دەکرد، راست دەکەوتە ئەو شوێنە. ئەو جێگایەی ئێستا ببووە پازگای ئۆردووگا. خەڵکی ئەو شارۆچکەیە، رۆژانی جێژن، لەو مەیدانە کۆ دەبوونەوە، وەک ئێستا کە زیندانییەکان ئەو سەر جادەیان گرتبوو.

ئەو ئێشکگرانەی تا چەند سات لەمەو پێش لەبەر ئاگر خۆیان گەرم دەکردەوە، لە پازگا هاتنە دەرێ. بەرامبەریان راوەستان. «قۆپچەی کەوا و پاڵتۆکانتان بکەنەوە!» ئینجا زیندانییەکان باڵیان لێک کردنەوە تا باشتریان بپشکنن. وەکو بەیانی. ئێستا قۆپچەکردنەوەیان لەبەر گران نەبوو. ئیتر گەیبوونەوە ماڵێ.

***

کە دەیانگوت ماڵێ، مەبەستیان ئێرە بوو. پیاو کە لە دەرەوە کاری دەکرد، تاقە ماڵێک کە شکی بردبا، ئۆردووگا بوو.

ریزەکانی پێشەوەیان دەپشکنین. شۆخۆف چووە پەنا سیزار و گوتی: «سیزار مارکۆڤیچ، کە گەیشتینەوە ئۆردووگا، من یەکسەر دەچمە بەشی ئەمانەتییەکان، جێگات بۆ دەگرمەوە.»

سیزار ئاوڕی دایەوە. کلکەی سمێڵە ڕەش و باریکەکانی زوقمیان لێ نیشتبوو. لە وەڵامدا گوتی: «جا کەڵکی چییە، ئیڤان دنیسۆڤیچ؟ بەچی دیارە شتم بۆ هاتووە؟»

«بەشکوو ناردبیان، بەڵام قەیدی نییە، من دە دەقیقە چاوەڕوان دەکەم، ئەگەر نەهاتی دەچمەوە خەوگە.»

شۆخۆف بیری لەوە کردبۆوە ئەگەر سیزاریش هیچی بۆ نەهاتبێ، دەتوانێ جێگاکەی لەناو سڕەدا بفرۆشێتەوە.

بەڵام پێدەچوو سیزار زۆر چاوەڕوانی شت بێ؛ گوتی:

«چاکە، ئیڤان دنیسۆڤیچ، بڕۆ نۆرە بگرەوە، بەڵام لە دە دەققە زیاتر لەوێ مەبە.»

نۆرەی پشکنینیان نزیک ببۆوە. شۆخۆف ئەمڕۆ هیچی شاردنەوەی پێنەبوو، خەیاڵی ئاسوودە بوو. بە کاوەخۆ دوگمەی پاڵتۆ و پەتکی ناوقەدی کردنەوە.

هەرچەند دەیزانی شتێکی خراپی پێنییە، بەڵام هەشت ساڵ ژیانی ئۆردووگا فێری کارقایمی کردبوو. بۆ دڵنیایی دەستی دە گیرفانی پانتۆڵەکەی نا. ئەو تیخەڵە پۆڵایەی لە کن کارگە دیبوویەوە لە گیرفانیدا بوو! تەنیا بۆ ئەوە هەڵیگرتبۆوە، پێی حەیف بوو لەوێ بکەوێ، بۆ ئەوەی نەبوو بیهێنێتەوە ئۆردووگا، بەڵام هێنابوویەوە و دڵی لێ بەر نەدەبوو. دەکرا تیژی بکا و بۆ پینەکردنی چەکمە و بڕینی پەڕۆیان کەڵکی لێوەربگرێ.

ئەگەر ویستبای تیخەڵەکە بە دزی بێنێتەوە ئۆردووگا، دەبوو پێشتر فێڵێکی بۆ دۆزیبایەوە. بەڵام تازە دوو ڕیزی مابوون بگاتە شوێنی پشکنین، وا ڕیزی یەکەمیش گەیشتێ.

دەبوو تا زووە بیرێک بکاتەوە. تا لە دوای کەسانی پێش خۆی بوو، دەیتوانی تیخەڵەکە فڕێ بدا. (دوایە دۆزیباشیانەوە، کێ بە کێ بوو.) یانژی دەبوو ڕێگایەک بۆ بردنەوەی بدۆزێتەوە.

ئەگەر تیخەڵەکەیان لێ گرتبا و گوتبایان چەقۆیە، دە ڕۆژیان زیندانی دەکرد.

بەڵام بە چەقۆیەکی وا مرۆ دەیتوانی لە ئۆردووگا پووڵ و پارەیەک پەیدا بکا و بە ئێرووییەک بگا. حەیف بوو لە کیسی بدا، بۆیە لەناو لینگە دەستکێشێکی ڕۆکرد.



ڕیزی پێشەوەیان بۆ پشکنین گاز کرد. ئێستا تەنیا سێ کەس لەبەر ڕووناکایی تیشکاوێژەکە ڕاوەستابوون. سێنکا و شۆخۆف و ئەو خۆرتەی دەستەی سی و دوو کە مولداوییەکەی دۆزیبۆوە.

پێنج پاسەوان دەیانپشکنین. شۆخۆف دەبوو هۆشوگۆشی تەواو کۆ بکاتەوە و لەو دوو پاسەوانەی لەلای ڕاست بوون، یەکیان هەڵبژێرێ. یەکیان پیرە پاسەوانێکی سمێڵ ماشوبرینج بوو، ئەوی دیکەش کوڕۆکەیەکی سەر کوڵمە سوور بوو. شۆخۆف پاسەوانە پیرەی دەستنیشان کرد. دیارە کابرا لە کاری خۆیدا کارامە بوو و ئەگەر کەیفی لێ با بە ئاسانی تیخەڵەکەی دەدۆزیەوە. سەرەڕای بە ساڵداچوونی، چاومارێک بوو لەو گۆڕەی.

ئینجا شۆخۆف هەر دوو دەستکێشی داکەندن و بە دەستییەوە گرتن. (دەستکێشە بەتاڵەکەی لە سەرەوە دانا)، پەتکی ناو قەدیشی هەر بەو دەستەی گرت. ئێخەی پاڵتۆ و کەوایەکەی تەواو ئاوەڵا کردن. (جاران وای نەدەکرد، بەڵام ئێستا وای دەنواند هیچی لە جلەکانیدا نەشاردۆتەوە) چووە لای پاسەوانە سمێڵ ماشوبرینجەکە.

کابرا دەستی بە پشت و کەلەکەیدا هێنا. باخەڵی پانتۆڵ و بەری پاڵتۆ و کەوایەکەی گەڕا، هیچی نەدۆزیەوە. خەریک بوو دەرباز دەبوو کە پاسەوانەکە بۆ دڵنیایی دەستی لەسەر دەستکێشە خاڵییەکە دانا. شۆخۆف شەلاڵی ئارەقە بوو. هاتباو دەستکێشەکەی تری پشکنیبا، پێوە دەبوو. زیندانی تاکەکەسی بە سێسەد گرام نانی ڕۆژانە و بە سێ ڕۆژ جارێک شێوی گەرمەوە چاوەنۆڕی بوو. بیری لەوە کردەوە لەوێ لە برسان تووڵەک دەبێ و جارێکی دی زەحمەت بوو جێگای خۆی بگرێتەوە و بەو پارووە نانە نەمر نەژییەی ئۆردووگا قەڵەو بێتەوە.

لە خۆوە دەستی بە دوعا خوێندن کرد: «خوایە فریام کەوە، مەیەڵە لە حەپسی ئینفرادیم بپەستێون!» ئەو وشانەی بە مێشکدا دەهاتن کە پاسەوانەکە لە پشکنینی دەستکێشەکە بۆوە و دەستی بۆ لینگە دەستکێشەکەی دی برد. (ئەگەر شۆخۆف هەر دووکی بە دەستێک نەگرتبان، پێکەوە هەرتکی دەپشکنین) لەو ساتەوەختەدا ئەفسەری پاسەوان کە پەلەی بوو زووتر کارەکە لە کۆڵ بکاتەوە، بە سەر موفەتیشەکانیدا گوڕاند: «لەکۆڵی کەنەوە، نۆرەی ئەفرادی کارگەی کەرستەسازییە!»

پاسەوانە پیرە دەستی لەسەر دەستکێشەکەی شۆخۆف کێشایەوە و بۆ نێو ئۆردووگا پاڵی دا.

***

شۆخۆف رای کرد تا خۆی بگەیەنێتەوە بەندییەکانی تر. بەندییەکان وەک ئەسپی بازاڕی ئەسپان، بە پێنج ریز لە نێو دوو پەرژیناندا راوەستابوون. دەتگوت دەو پەرژینانەیان خستوون. شۆخۆف لە خۆشیان خەنی ببوو، بەڵام دوعای شوکرانەی نەخوێند، دەرفەتی ئەوەی نەبوو و ئەو ئان و ساتە کوا کاتی دوعا خوێندن بوو؟

ئەو پاسەوانانەی بەندییەکانیان هێنابوونەوە ئۆردووگا، جێگای خۆیان دا بە پاسەوانی دیکە. چاوەڕوانی هاتنی گەورەکەیان بوون. ئەو دارانەی زیندانییەکان بەر لە گەیشتنە پازگا هەڵیانڕشتبوون، ئەوان کۆیان کردبوونەوە. ئێزینگەکانی خۆیان، لە پێش پازگا، لەسەر یەک هەڵدرابوونەوە!

مانگ تا دەهات پتر هەڵدەکشاو هەوا ساردتر دەبوو.

سەرپاسەوان کە بەرەو پازگا دەڕۆیی تا لیستی ناوی ئەو چوارسەد و شەست و سێ زیندانییەی هێنابوویاننەوە ئۆردووگا بە کاربەدەستان ئیمزا بکا، راوەستا و چەند پەیڤێک لەگەڵ «پریاخا»ی جێگری ڤۆلکۆڤی ئاخافت، ئینجا نەڕاندی: «زیندانیی ژمارە ک-٤٦٠!»

مولداوییەکە کە لەناو زیندانییەکاندا خۆی لە مەئموورەکان شاردبۆوە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەرەو پەرژینی لای راست رۆیی. هێشتا سەری داخستبوو و خۆی کوشم هەڵێنابوو.

پریاخا فەرمانی پێدا بچێتە ئەودیوی پەرژینەکە: «وەرە ئێرە!»

مولداوییەکە لە ریز تاق بۆوە، پێیان گوت دەستەکانی لەسەر پشت ملی دابنێ و چاوەڕێ بێ. مانای ئەو کارە بۆ هەمووان ئاشکرابوو. مولداوییەکە بەتاوانی «هەوڵدان بۆ هەڵاتن» دەکەوتە حەپسی تاکەکەسی.

دوو پاسەوان، یەک لەلای چەپ و ئەوی تر لە لای راستی پەرژینەکان لەبەر دەروازە راوەستابوون. دەروازەکانی ئۆردووگا سێ هێندی بەژنی مرۆڤ بەرز بوون. کردیانەوە و دەستووریان دا: «بە پێنج ریز..!»



لێرە ئیتر لە پێش دەروازەیان نەدەکشاندنەوە. هەر دووک دەروازە لە ژووریڕا دەکرانەوە و بەندییەکان هەرچەند لە پشتەوەڕا پاڵیان پێوە نابان مەحاڵ بوو لە جێی خۆیان ببزوون.
«یەک، دوو، سێ..!»

سەری شەو کاتێک زیندانییەکان لەو دەروازانە دەپەڕینەوە لە سەرمان و لە برسان هەر لاکەی سەریان دەهات ئەو شڵپیتاوە کوڵیوەی دەیاندانێ، وەک بارانێک بەسەر دەشتێکی وشک و قاقڕدا بباریێ وا بوو. یەکجێ لرفیان دەدا. ئەو قاپە شێوەیان لە گیان، لە ئازادی، لە رابردوو و لە داهاتووش خۆشتر دەویست. برسی و بێ سەبر، بە هات و هاوار، وەک سەربازی لە شەڕگە گەڕاوە، بە ئۆردووگا وەردەبوون. کەس نەیدەوێرا تخوونیان بێ.

خزمەتکاری بارەگای فەرماندەیی کە چاوی پێکەوتن هەترەشی چوو و کوڕەگوێ بوو. لە سەرژمێریی بەیانییەوە تا ئێستا، ئەوەندە ئەگەر هەدایەکیان دابا. لە پەرژینەکانیش تێپەڕین و گەیشتنەوە. ئیتر ئازاد بوون. جگە لە سەردەستەکان کە موفەتیشی کار بانگی کردن: «سەردەستەکان بچنە بەشی بەرنامەرێژی!»

***

شۆخۆف بە غاردان لە بینای زیندان و خەوگە تێپەڕی و چووە بەشی ئەمانەتییەکان. سیزاریش بەلایەکی دیکەدا خۆی گەیاندە دارتێلێک کە چەند کەس لە ژێریدا کۆ ببوونەوە. دارتێلەکە تەختەیەکی سێتوێی پێوەبوو، بە قەڵەمی دار نێوی ئەو زیندانییانەی لێنووسرابوو کە شتیان بۆ هاتبوو.

لە ئۆردووگا کاغەزیان زۆر دەکار نەدەکرد. لە باتی کاغەز ئەغڵەب کەڵکیان لە تەختەی سێتوێ وەردەگرت. ئەو تەختانە پتریان خۆ رادەگرت. موفەتیش و پاسەوانەکانیش بۆ ژماردنی زیندانییەکان کەڵکیان لەو تەختانە وەردەگرت. تەختەکە دەکرا هەموو جارێ پاکی بکەیەوە و سەرلەنوێ شتی لەسەر بنووسی. ئەو زیندانییانەی بۆ کار نەدەبرانە دەرەوەی ئۆردووگا، دایمە لە دەوری ئەو دارتێلە بوون. کە یەکێک شتی بۆ دەهات ناوەکەیان دەخوێندەوە و لەبەر دەروازە ژمارەکەیان پێدەگوت. بەو جۆرە یەک دوو دەنک جغارەیان پێ دەبڕا.

شۆخـۆف بە راکـردن خـۆی بە ژووری ئەمـانەتـیـیـەکـاندا کـرد. ژوورێک بوو بە تەنیـشت خـانوویەکەوە کە دالآنێکی داپۆشراوی هەبوو. دالآنەکە دەرگـای نەبوو. سـەرمـا یەکسـەر خۆی بە ژوورێدا دەکرد. بەڵام لەو تۆف و بەندەدا هەر ئەنوایەک بوو.

زیندانییەکان لە پەنا دیوار سڕەیان گرتبوو. شۆخۆفیش لە ریزەکە راوەستا. پازدە کەسی لە پێش بوو، بە سـەعـاتێک نۆرەی دەهات. تا ئەو دەم چراکـانیـان هەڵنەدەکـردن. ئەگـەر کەسێکی دیکەی دەستـەکەیان شتی بۆ هاتبێ- سەرەتا دەبوو بچێ و ژمارەکەی لەسەر تەختەکە بدۆزێتەوە- لەدوای ئەو رادەوەستا. ئینجا بەندییەکانی کارگەی کەرستەسازیش دەگەیشتنێ. بەو پێیە تا بەیانی نۆرەیان نەدەهات. بە خۆ و جانتا و کیسەکانەوە سڕەیان دەگرت. لە نووسینگەکەدا (شۆخۆف لەو ئۆردووگایە قەت هیچی بۆ نەهاتبوو، ئەمەی لە زیندانییەکانی دیکە بیستبوو) پاسەوان ئەو سندووقە دارە، کە شتەکانتی لەناودا بوون، دەیشکاند، کـەلوپەلەکـانی لێ هەڵدەرشـتی، دەیدڕاندن، سـەراوبنی دەکـردن و ئەگـەر مرەبایەک شتێک لەناو شووشە یان قوتوویەکدا با، لەبەر چاوی خۆت بەتاڵی دەکرد. هەر ئەوەندەت پێدەکرا لەپی دەستت یان کیسەیەک شتێکی وەبەر بگری. شووشە و قوتوویان نەدەدایە زیندانی. نیگەرانی بۆ دروست دەکـردن. ئەگـەر نانی خـۆمـاڵی، شـیـرینی و خواردەمەنییەکی لەو بابەتە لە ناو شتەکاندا بایە، یان ماسی و سۆسیسێک، پاسەوان قـەپاڵـتـەیەکی لێدەدان. (هات و هاوار و نارەزایەتیش دادی نەدەدای، چونکە بێ سێ و دوو لێکردن دەستیان بەسەردا دەگرت و دەیانگوت قەدەغەیە.) ئەوی شتی بۆ هاتبا دەبوو هەموو ئەو زیندانییانەی سڕەیان دەگرت سەرو شتێکیان بداتێ. پاسەوانیش هەروەتر. پاش پشکنین سندووقەکەیان نەدەدایەی، خۆراکەکەیان بۆ لە ناو کیسە یان پاڵتـۆکەت دەکـرد و وەدەریان دەنای و بانگی کـەسی دوای تۆیان دەکـرد. جـاری وابـوو سـەریان وا لێدەشێـواندی، شتێکت لەسەر سەکۆیەکە لەبیر دەچوو. ئەگەر بۆشی گەڕابایەوە، تازە چاوت پێ نەدەکەوتەوە.

***

ئەو دەم کە لە ئوست-ئیژما بوو، ژنەکەی یەک دووجار شتی بۆ دەنارد. بەڵام شۆخۆف لە نامەیەکدا بۆی نووسی چیدی شتی بۆ نەنێرێ. ئاخر تا پێی دەگەیی، خواردنەکان هیچی ئەوتۆیان لێ نەدەمایەوە. وا باشتر بوو ئەو خواردنە بداتە منداڵەکانیان هەرچەند بە لای



شۆخۆفەوە بەخێوکردنی ژن و منداڵەکانی لەوێ، لە تێرکردنی زگی خۆی لێرە، ئاسانتر بوو، بەڵام دەیزانی ناردنی ئەو شتـانە، چ کـوێرەوەری و بـارگرانـیـیـەکی دەوێ و ئەوان ناتوانن دە سـاڵی ڕەبەق لە دەمی خـۆیان بگرنەوە و بۆ ئەوی بنێـرن. خـواردنی وای بە گەروویدا نەدەچووە خوارێ.

بەم حاڵەشەوە هەموو جارێ کە کەسێکی دەستە یان خەوگەکەیان شتی بۆ دەهات- زۆربەی رۆژان شت دەهات- لە قـووڵایی دڵیدا غـەمێکی سەیر دایدەگرت. گەرچی بۆ ژنەکەی نووسیبوو تەنانەت بۆ جێژنی پاکیش هیچی بۆ نەنێرێ، قەتیش بەلای ئەوێهێ دارتێلدا نەدەچوو مەگەر بۆ دیتنەوەی ناوی یەکێ لە هاوبەندییە دەوڵەمەندەکانی، بەڵام هێشتا ئەو بیرەی لە مێشکیدا مابوو کە لەوانەیە رۆژێکیان کەسێک غار بداتە پێشی و بڵێ: «شۆخۆف، بۆ ناچیە بەشی ئەمانەتییان، شتت بۆ هاتووە!»

بەڵام هەرگـیـز یەکێک بە پیـریەوە نەهات و، رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر مەیلی ماڵ و زێدی خـۆی دەنا. لێـرە لە سـیـوادی بەیانیـیـەوە تا ئەنگۆڕەی شـەو پێی لە عـەرزی دەکـوتاو دەرفەتی ئەوەی نەبوو خەیاڵپلاوان بکا.

لەگـەڵ ئەوانی دیکەدا لەناو ریز راوەسـتـابوو، ئەوانەی بەڵێنیـان بە ورگـیـان دابـوو بەو زووانە دووگی بەراز بخـۆن، رۆنی کـەرە لە نان هەڵسـوون و دیشلەمەی بەسەرداکـەن. شــۆخــۆف تەنیـــا ئاواتێکی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو بە وەخت لە خــواردنگە خــۆی بگەیەنێـتەوە ئەفرادی دەسـتەکەی و شێـوەکەی بە گەرمی فڕ بکا. ئەو شێوە کـە سارد دەبۆوە تامی نەدەما. وای لێک دایەوە ئەگەر سیزار ناوی خۆی بە تەختەکەوە نەدیبێ تا ئێستا گەیشتۆتەوە خەوگە و ئێستا خەریکی شۆردنی دەست و چاویەتی. ئەگەر ناویشی بەوێوە بووبێ، ئێـسـتـا خـەریکی دەرهێنانی کـیـسـە و پەرداخـە پلاسـتـیـکەکـەیەتی تا خواردەمەنییەکانیـان تێبکا. شۆخۆف بەو فکرەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی دە دەقەی تر رادەوەستم، تەنیا بۆ ئەوەی دەرفەت بداتە سیزار.

***

هەندێ هەواڵی لەو کـەسـانە بیـست کە لە ریزەکـەدا بوون. ئەو حـەفـتـەیەش پشـووی یەکشەممەیان نەبوو. کاربەدەستان دیسانەوە تووشیان کردبوون. ئەوە یەکەم جاریان نەبوو.

هەر مانگێکی پێنج یەکشەممەی تێدا هەڵکەوتبان، سێ ڕۆژیان دەکردە پشوو و دوو ڕۆژەکەی تریش زیندانییەکانیان دەناردە سەر کار. شۆخۆف دەیزانی وایە، بەڵام بە بیستنی ئەو هەواڵە دەتگوت شاخی بە سەردا ڕووخا، هێڵنجی هات. پیاو هەروا بە سووک و ئاسانی، لەدەست دانی یەکشەممەی بۆ قووت نەدەچوو. هەواڵەکە ڕاست بوو، بەڵام ئەگەر یەکشەممەکەیان کردباشە پشوو، لە ئۆردووگا بێگاری وەک دروستکردنی حەمام، دانانی دیوارێک، یان خاوێن کردنەوەی حەوش و بەرەی ئۆردووگایان پێدەکردن. هەڵخستن و ڕاوەشاندنی دۆشەگان، کوشتنی کێچ و ئەسپێی نوێنانیش لەوێ ڕاوەستێ. یان ڕیزیان دەکردن دا بزانن تەرحیان لە وێنەی ناو فایلەکانیان دەکا؟ ئان ئۆینی یادداشت کردنی لیستی کەلوپەلەکانیان بوو، ئەو دەم دەبوو سڕو سیپالان لە خەوگە وەدەرنێن، دانە وەختێک بە خۆڕایی لەدەرێ ڕایاندەگرتن.

کاربەدەستان بە هیچ شتێک هێندەی چێشتەخەوی دوای قاوەڵتیی بەندییەکان، قەڵس نەبوون.

ڕیزەکە بە خاوی دەچووە پێش. سێ زیندانی -سەرتاشەکە و یەک لە سکرتێرەکان و یەکێکی بەشی بارهێنانی ڕۆشنبیری- بێ ئەوەی خۆ تێک بدەن خۆیان لە ڕیزەکە ڕاکرد. ئەو زۆڵانە هەڵاواردە بوون و لەگەڵ زیندانیانی قوڕبەسەر جیاواز بوون. بە هیچ شێوەیەک زیندانییان بە پیاو نەدەزانین و بێزیان نەدەهات بیاندوێنن. نەشدەکرا لێیان وە دەنگ بێی. هەموو کلکیان لێک ئاڵاندبوو و نێوانیان لەگەڵ پاسەوانەکانیش خۆش بوو.

شۆخۆف، دە کەس لە پێشەوەی و هەشت لە دواوەی بوون. سیزار پەیدا بوو. کڵاوێکی نوێی لەسەر بوو کە لە دەرەوە بۆیان ناردبوو. سەری نەوی کرد و هاتە ناو ئەنوایەکە. بێگومان سمێڵی یەکێکی چەور کردبوو کە دەیتوانی بە کڵاوێکی وەهاوە کە خەڵکی شارە مەزنەکان لەسەریان دەنا، بۆخۆی لەو ناوە بسووڕێتەوە. کاربەدەستان تەنانەت شەپقەی سەربازیشیان لە زیندانییان دەستاند، زیندانی تەنیا دەیتوانی تەپلە ساکارەکەی ئۆردووگا لەسەر بنێ کە لە کەوڵی بەراز دروست کرابوون.

***

سیزار بە ڕووی شۆخۆفدا پێکەنی و ڕووی لەو پیاوە شێتە چاویلکە لە چاوە کرد کە سەری



بەسەر ڕۆژنامە ڕۆگرتبوو، گوتی: «بەه بەه، پیۆتر میخائیلۆڤیچ، دۆستی خۆشەویستم.» دەتگوت سەد ساڵە یەکتریان نەدیوە، لە قسان ئاڵان.

کابرا تێکسڕماوە چاویلکە لە چاوەکە گوتی: «چاو، چیم هەیە! ژمارەیەکی نوێی ڤێچۆرکا[١٢]، بە پۆستی هەوایی بۆیان ناردووم.»

سیزار گوتی: «زۆر سەیرە!» ئەویش سەری بردە سەر ڕۆژنامەکە. (ئەو غەزەب لێگرتووانە، لەبەر ئەو ڕووناکییە کەمەی ڕاڕەودا، ئەو پیتە وردانەیان چۆن پێ دەخوێنرایەوە؟) «وتارێکی زۆر جوانی لەبارەی شەوی دەست پێکردنی بەرهەمێکی نوێی زاڤادسکی[١٣]-یەوە تێدایە.»

ئەو مۆسکۆییانە لە هەر کوێ بان وەک چوارپێ بە بۆن یەکتریان دەدۆزیەوە، کە دەکەوتنە لای یەکتریش هەرکام لە چەنەوەریدا دەسکی لە دووی ئەوی دی نەدەکرد. پیاو وشەیەکیان لێ تێنەدەگەیی. زیاتر وە لاتڤی یان ڕۆمانی دەچوون نەک ڕووسی و ڕووسی زبانان.

***

سیزار هەر تەوورەکە و جانتای هەیبوو هێنابوونی. شۆخۆف لێی پرسی: «سیزار مارکۆڤیچ، من بڕۆم؟»

سیزار سەری لە بان ڕۆژنامەکە هەڵبڕی و گوتی: «ئا، ئا.. جێگای من لە ڕیزەکەدا کامەیە؟ من لەدوای کێم؟» شۆخۆف شوێنەکەی پێ نیشان دا و بێ ئەوەی لەسەر سیزار ڕابوەستێ قسەیەک بکا، لێی پرسی: «حەز دەکەی شێفەکەت بۆ بێنم؟» (مەبەستی ئەوە بوو بەشە خۆراکەکەی بۆ لە قوتوویەک بکا و لەگەڵ خۆی بیباتەوە خەوگە. ئەو کارە نایاسایی بوو. ئەگەر بەگیریان کەوتبای خۆراکەکەیان لێدەڕشتی و دەشیانگرتی. بەم حاڵەشەوە زیندانییەکان ئەو کارەیان هەر دەکرد. چونکە ئەگەر یەکێک کارێکی وای هەبوایە پێش خواردنی شێف بیکا، مەحاڵ بوو بتوانێ خۆی بگەیەنێتەوە ئەفرادی دەستەکەی لە خواردنگە.) لەو ساتانەدا شۆخۆف لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «نا، هێندە ڕەزیل و ڕژدیش نییە، شێفەکەی دەدا بە من.» بۆ شێف سووپیان نەبوو، تەنیا دۆکوڵیویان دەدانێ.

«نا ، نا» سیزار پێکەنی. «با بۆ خۆت بێ.»

***

شۆخۆف ئەوەی لە خوا دەویست. لە حاڵێکدا لە خۆشیان خەریک بوو باڵ بگرێ، وەدەر کەوت و بە غاردان لەوێ دوور کەوتەوە. بەندنییەکان بەو گۆڕەپانەدا بڵاو ببوونەوە. سەردەمایەک فەرمانده ئەمری پێکردبوون کە زیندانییەکان نابێ لە دەرێ بسووڕێنەوە و جگە لە هاموشۆی دەرمانگا یان ئاودەسخانە کەس نەیدەتوانی لە دەستەکەی جوێ بێتەوە. بۆ ئەو جۆرە شوێنانەش دەبوو چوار پێنج کەسی لەگەڵ چووبان، یەکیش وەکو دەمڕاست دەیبردن و دەیهێنانەوە.

ئەوکات فەرماندەی ئۆردووگا، کابرایەکی بە زیپک و زاکوون بوو، کەس نەیدەوێرا لە ئاستیدا بکۆخێ. پاسەوانەکان ئەوی بەتەنێ گرتبایان، لە سلوولی تاکەکەسیان توند دەکرد. بەڵام وەکو هەموو فەرمانێکی توندوتیژ، ئەو فەرمانەش ورده ورده شل کرایەوەو پاسەوانەکان پشتگوێیان خست. گریمان کاربەدەستان لە دووی کەسێکیان ناردبا، پیاو نەدەکرا ئەفرادی دەستەکەی لەگەڵ بن، یان بۆ وێنە ئەگەر بۆ وەرگرتنی شتێک چووبایە عەمبار، بۆ دەبوو هەمووت لەگەڵ بێن؟ یان ئەگەر یەکێک کرمی سەری جووڵابا و ویستبای بچێتە بەشی رۆشنبیری، رۆژنامە بخوێنێتەوە، کێ لەگەڵی دەهات؟ یا یەکێک دەیویست چەکمەکانی بباتە لای پینەدۆز، یەکی تر دەچووە حەمام جلەکانی وشک کاتەوە، ئەوی دی سەردانی خەوگەی دراوسێی دەکرد (بەتوندی پێشی ئەو کارەیان دەگرت، بەڵام کەس گوێی نەدەدانێ.)

سەگبابی فەرمانده، تەرەسی زگ زل، بەو فەرمانەی دەیویست ئەوەندووکە سەربەستییەی هەشیانە، لێیان زەوت بکا، بەڵام خراپی تێکوشیبوو.

شۆخۆف لە رێگایە تووشی پاسەوانێک بوو. چەند هەنگاوی مابوو بیگاتێ کڵاوی داگرت و خۆی بە خەوتنگادا کرد. لە خەوگەدا هەڵڵایەکی سەیر بوو. کاتێ زیندانییەکان بۆ کار وەدەرکەوتبوون، جیرەی نانی زیندانییەک دزرابوو و ئێستا هەموو سەرخزمەتکارەکان هەراو هۆریایان دانابوو، خزمەتکارەکانیش جوابە جەنگییان دەکردن. کەسی دەستەی سەد و چوار لەوێ نەبوو.



شۆخۆف زۆر جار دەیگوت کە دێینەوە ئۆردووگا ئەگەر دۆشەگەکانیان سەروبن نەکردبن، دەبێ کڵاو هەڵاوێین نەیگرینەوە. هەروا کە بەرەو تەختەکەی دەچوو، پاڵتۆیەکەی داکەند. لەگەڵ دەستەوانە و تیخەڵەکە هاویشتنیە سەر تەختە و دەستی لە نێو دۆشەگەکەی راکرد. نانەکە مابوو! چاک بوو کونی دۆشەگەکەی بە دەرزی و دەزوو دروووبۆوە.

ئینجا لە خەوگە وەدەرکەوت و بەرەو خواردنگە رۆیی.

لە رێگایە تووشی پاسەوانان نەبوو. تەنیا چەند زیندانیی دیتن کە لەسەر جیرە دەمەقاڵەیان بوو.

مانگەشەو تا دەهات ئەو ناوەی روونا کتر دەکردەوە. چراکانی ئۆردووگا کز دیار بوون و خەوگەکان سێبەرێکی رەشیان خستبووە سەر زەوی. چوار پلیکانە زلەکانی پێش خواردنگەش وە نێو تاریکی کەوتبوون.

چرای سەر دەرانەی خواردنگە لەو هەوا ساردەدا کز دەسووتا. خەرمانەیەک لە پەلکەزێرینە، لە دەوری گشت چراکان دەبینران کە نەتدەزانی لەبەر چڵکنی و پیسییان بوو یان ئەو کەرەسیسەیەی لێیان نیشتبوو.

فەرمانده هێندێک رێسای زەحمەتی دیکەشی دانابوون. دەستەیەکان دەبوو لە دوو ریزدا بچنە خواردنگە. هەر دەستەیەکیش کە دەگەیشتە خواردنگە، دەبوایە دیسان بە پێنج ریز بوەستێ و چاوەڕێ بن، تا خزمەتکاری خواردنگە ئیزنیان بدا بچنە ژوورێ.

کاری ئەو خزمەتکارە گێرەی خواردنگە ئەوەندە بوو، دنیا خرا ببا بەبێ ئیزنی ئەو، کەس نەیدەتوانی پێ لە خواردنگە بنێ. بەو لاقە شەلەیەوە خۆی وەک «کەم ئەندام» لە قەڵەم دابوو، دەنا ئەو حەرامزادەیە چ بەڵای لێنەبوو. گۆپاڵێکی داری (غان)ی بەدەستەوە دەگرت و لەسەر پلیکانەکانرا لەسەرو سەکوتی زیندانییەکانی دەدا. بەڵام ئەویش پیاوی خۆی دەناسی. چاوی وەک چاوی گورگ تیژ بوون و لە تاریکەشەویشدا دەیزانی لەکێ دەدا. یەکێک زانیبای لەبەری دانانوێنێ، نەیدەوێرایە. هەر بە کڵۆڵان دەوەستا. جارێکیش لە شۆخۆفی دابوو.

هەموو خزمەتکارەکان لە تۆرەمەی ئەو بوون. کەسیان بە پیاو نەدەزانی و لەگەڵ ئاشپەز کلکیان لێک دەهاڵاند.

پێش خواردنگە قەرەباڵغ بوو. پێدەچوو چەند دەستە وێکڕا گەیشتبنێ، لەوانەشبوو شتێک رووی دابێ. هەموو لەسەر پلیکانەکان بوون. سێ کەس بەردەرگای خواردنگەیان گرتبوو. کابرا شەلە و وەرگێڕکەکەی و، خودی سەرپەرشتیاری خواردنگەش. ئەو زۆڵانە لەوێ چەقیبوون و ئاگایان لە هەموو لایەک بوو.

سەرپەرشتیاری خواردنگە پیاوێکی کەتەی تێکسڕماو بوو، کەللەی سەری بەقەد کوولەکەیەکی شەقەپاغی دەبوو. هێندەی هێزو گوڕ هەبوو نەیدەزانی چی پێ بکا. دەست و پێی رانەدەوەستان و هەمیشە هەڵدەبەزیەوە. تەپلەیەکی لەسەر بوو دەتگوت بەفری سپییەو ژمارەی پێوە نەبوو. لە «دەرێ» کەم کەس تەپلەی وا لەسەر دەنێ. پەستەکێکی کەوڵە بەرخی دە بەردابوو کە ژمارەیەکی هێندەی پوولی پۆستەی پێوە دەبینرا، هەر بەشی ئەوە ڤۆلکۆڤی پێ قایل بێ. بەڵام پشتی پەستەکەکەی ژمارەی پێوە نەبوو. ئەو تەرەسە گونی بەکەس نەدەچوو، هەموو لێی تۆقیبوون. گیانی سەدان کەسی لەبەردەستدابوو. جارێکیان زیندانییەکان پەلاماریان دا و ویستیان لێی بدەن، بەڵام ئاشپەزەکان لەسەریان کردەوە. ئەو سەگبابانەش پێڕی خۆیان هەبوو.

ئەگەر دەستەی سەد و چوار چووبا ژوورێ، شۆخۆف تووشی دەردەسەری دەبوو. کابرای گێڕ بە تیلەچاوێک زیندانییەکانی دەناسینەوە و لە کن سەرپەرشتیاری خواردنگەش مەحاڵ بوو بێلێ زیندانی لەگەڵ دەستەیەکی دی بچێتە ژوور. ئەو، مەبەستی تەنیا ئەوە بوو ئازاریان بدا. زیندانییەکان جاری وابوو وەسەر پەرژینەکان دەکەوتن و خۆیان دەگەیاندە سەر پلیکانەکان. شۆخۆفیش ئەو کارەی کردبوو. بەڵام ئەمشەو لە پێش چاوی سەرپەرشتیار، کاری وا نەدەکرا. بەیەک مشتەکۆڵە زیندانیی وا تخێڵ دەکرد دەبوو یەکسەر بیبەنە نەخۆشخانە.

شۆخۆف دەبوایە تا زووە خۆی بگەیەنێتە سەر پلیکانەکان و لەوێوە دەستەی سەد و چوار لە ناو ئاپۆرەکەدا بدۆزێتەوە. لەو ئەنگوستەچاوەدا و بەو پاڵتۆ رەشانەوە هەموو لێک دەچوون. زیندانییەکان وەک ئەوەی خەریکی گرتنی قەڵایەک بن، بە مست و پێلەقان دریان بە خەڵکەکە دەدا و بەرەو پلیکانەکان دەڕۆیین. (چارەیان نەبوو، درەنگ ببوو.)

پیاوە شەلەکە هاواری کرد: «راوەستن، گەوادی داک حیزینە!» ئینجا بە دارەکە لێیان راسا. «نەکشێنەوە، هەموو قالبتان دەشکێنم.» ئەوانی پێشەوە هاواریان کرد. «خەتای ئێمە نییە، لە پشتەوەڕا پاڵمان پێوە دەنێن!»



راستیان دەکرد. لە پشتەوەڕا پاڵیان پێوە دەنان، بەڵام ئەوانیش پێیان نەدەچەقاندن و پێیان خۆش بوو بە پاڵەپەستۆی خەڵکەکە بچنە پێشەوە. ئینجا کابرای شەل تێلایەکەی لە پێش خۆی راگرت تا رێگاکەی پێ بگرێ. بە هەموو قورسایی لەشی خۆی بۆ پێشەوە پاڵی دەدا. وەرگێڕەکەکەشی وەخۆ کەوت و هاتە کۆمەگی. تەنانەت سەرپەرشتیاریش دەستە ناسک و نازدارەکانی تووشی کار کردن و سەرێکی دارەکەی گرت.

چاکیان پاڵ پێوە دەنا. بەو هەموو گۆشتەی دەیانخوارد هەر دەبوو وا خووگە مل و بێڕەزا بن. کەسانی پێشەوە بەسەر ئەوانی دوای خۆیاندا بەر بوونەوە و هەموو وەسەر یەک گەڕان.

هاوارێک لە ناو جەماوەرەکە هەستا: «هەی لە خوشکت...، کەرە شەلە!» هەر کەسی بوو دەیزانی نایبینێ. ئەوانی دی بێ ئەوەی دەنگ بکەن بە پەلە هەستانەوە تا لەبەر پێیاندا نەچن. سەر پلیکانەکان چۆڵ بوو.

سەرپەرشتیار چۆوە ژوورێ و کابرا شەلە لەسەر پلیکانەکانڕا نەڕاندی: «جاشکەکەر، چەند جار بڵێم ببنە پێنج ریز! کە وەختی هات دەرگاکە دەکەمەوە.» شۆخۆف وای هاتە بەرچاو سێنکا کلێڤشینی لەناو ئاپۆرەکەدا دیوە. بە خۆشحاڵییەوە دڕی بە جەماوەرەکە دا تا خۆی بگەیەنێتێ. بەڵام ئاپۆرەکە وا تێک بەزیبوو نەیتوانی یەک هەنگاویش بچێتە پێش.

شەلە هەرای کرد: «دەستەی بیست و حەوت! وەرێ بکەون!» سەردەستەی بیست و حەوت وەسەر پلیکانەکان کەوت و چووە ناو خواردنگە، دوای ئەو، دیسان هەموو زیندانییەکان هرووژمیان کردە سەر پلیکانەکان. شۆخۆف خۆی وەپێش شەپۆلی ئاپۆرەکە دا. پلیکانەکان دەلەرزین و چرای سەر دەرانە رادەژا.

شەلە لە داخان شێت ببوو. نەڕاندی: «چ قەوما سەگباب!» ئینجا بە گۆپاڵەکەی کەوتە وێزەی یەک دوو زیندانی و دایپەڕاندنەوە خوارێ. دیسان سەر  پلیکانان چۆڵ بۆوە.

شۆخۆف پاڤلۆی دی کە وەسەر پلیکانەکان کەوت و خۆی گەیاندە کابرا شەلە. لە باتی تیۆرین، پاڤلۆ ببووە دەمڕاستی دەستە. تیۆرین حەزی نەدەکرد تووشی ئەو قەرەباڵغیانە بێ.

پاڤلۆ لەسەر پلیکانەکانەوە نەڕاندی: «سەد و چوار، بە پێنج ریز! ئەوانی پێشەوە ڕێگاکە بەر دەن!»

بەڵام ئەو نەفرەتییانە چما ڕێگایان بەر دەدا!

«هۆی، جێم کە با بڕۆم، دەستەی ئێمەیان بانگ کرد!»

شۆخۆف پاڵێکی بە کەسی پێش خۆیەوە نا، کابرا خۆی دەیویست ڕێگای بکا، بەڵام حاسێ ببوو.

ئاپۆرەکە بەملاو بەولادا شەپۆلی دەدان. بۆ قاپە دۆکولێوێک وەخت بوو ئەستۆی خۆیان بشکێنن. شۆخۆف بیرێکی دیکەی بە مێشکیدا هات. دەستی بەو پەرژینە گرت کە لەلای چەپەی پلیکانەکان درابوو، خۆی ڕەپێش کردو بەرەو لایەکەی تری پەرژینەکە قەڵەمبازی هاویشت. ئەژنۆی یەکێکی پان کردەوە، لە باتیان شەپێکیان تێهەڵدا و پڕ جنێویان کرد. بەڵام تازە ئەو بۆی دەرچووبوو. ئەفرادی دەستە چاویان پێکەوت و دەستیان بۆ درێژ کرد.

سەرپەرشتیار لە درزی دەرگاوە سەری وەدەرنا و بە کابرا شەلەی گوت:

«دوو دەستەی تر بنێرە با بێن.»

شەلە هاواری کرد: «سەد و چوار!» ڕووی کردە یەک لەو زیندانییانەی ئەوێ و گوتی: «بۆ کوێ دێی، کوڕی کەر!» تێلایەکیشی خێواندە پشت ئەستۆی.

پاڤلۆش بە دوای ئەودا هاواری کرد: «سەد و چوار!» ڕێگاشی بۆ دەستەکەی کردەوە.

شۆخۆف بەغار خۆی بە ژوورێدا کرد – لەسەر دەستووری پاڤلۆ ڕانەوەستا–و خەریکی کۆکردنەوەی کەشەفی بەتاڵ بوو. خواردنگە وەک هەمیشە هاڵاوی تێکەڕابوو. زیندانییەکان وەک دەنکی گەنمەشامی پاڵیان وێک دابوو. لە پشت مێزەکان دانیشتبوون، یان سینی بەدەستەوە، دریان بە قەرەباڵغیەکە دەدا. شۆخۆف دوای ئەو هەموو ساڵە چاک لێڕاهاتبوو. بە سیلە چاوێک زیندانیی ژمارە س–٢٠٨ی بەدی کرد. سینیەکی پێبوو کە تەنیا پێنج قاپە شێوی لەسەر بوون. سینیەکە بەتاڵ بوو، کەواتە دوامین کەرەتی بوو.

شۆخۆف خۆی گەیاندێ و لە دوایەڕا بە گوێیدا چرپاند: «کە لێبوویەوە سینیەکە بدە بە کاکی خۆت، هاوڕێ.»



«یەکێکی دی لە پشت دەلاقەوە چاوەڕوانی سینیەکەیە.»

«ملی شکێ، با چاوەڕوان بێ، زووتر با گرتبایەوە.»

پێک هاتن. س–٢٠٨ قاپەکانی لەسەر کەشەفەکە دانان و شۆخۆف لە دەستی ڕفاند. زیندانییەکەی دیکەش گەیشتە سەریان و لای دیکەی کەشەفەکەی گرت. ئەو لە شۆخۆف ڕیوەڵەتر بوو. شۆخۆف بە سینیەکە پاڵی پێوەنا و کابرا ڕەتێکی برد و خۆی لە کۆڵەگە کوتا. شۆخۆف سینیەکەی دە بن هەنگڵی نا و بەرەو دەلاقەکە وەڕێ کەوت. پاڤلۆ لووتی داژەنیبوو و لەریزەکەدا چاوەنۆڕی سینی بوو. کە چاوی بەو کەوت بووژایەوە. یاریدەدەری دەستەی بیست و حەوت لە پێش پاڤلۆ سرەی گرتبوو. پاڤلۆ پاڵی دا و گوتی: «دە بڕۆ، بۆ ڕاوەستاوی؟ نابینی سینیم پێیە؟»

هەتیوی چەمووش، گۆپچیک بە پێکەنینەوە کەشەفێکی هێنا و گوتی: «ئاگایان لێ نەبوو، هێنام.»

ئەو سۆدرەیە شتێکی بە شتێک دەکرد. دوای یەک دوو ساڵی تر کە گەورەتر دەبوو فێری هەموو فێڵ و فەندێک دەبوو.هیچ نەبێ دەیانکردە بەرپرسی دابەش کردنی نان لە عەمبار، دوور نەبوو پیشەیەکی لەوە گرنگتریشی بدەنێ. پاڤلۆ بە یەرمۆلیڤ–ی گوت کە سینیەکەی تر وەربگرێ.

(یەرمۆلیڤ خەڵکی سیبریا بوو، زەلامێکی چوارشانە بوو. ئەویش بە تاوانی بەدیل گیران بە دەستی ئەڵمانییەکان دە ساڵی بۆ بڕابۆوە). گۆپچیکیشی نارد تا جێگا بدۆزێتەوە. شۆخۆف سینیەکەی بە خشکە بەرێ کردە ناو دەلاقەکە و چاوەڕێ مایەوە.

پاڤلۆ لە پشت دەلاقەکەوە گوتی: «سەد و چوار!» چێشتخانە پێنج دەلاقەی هەبوو. سێ دانە، خواردنیان پێدا دەناردنە دەرێ، یەکیان بۆ خواردنی نەخۆشان (دە زیندانی گەدەیان بریندار بوو و خواردنی تایبەتیان وەردەگرت)، دەلاقەکەی دیکەش بۆ وەرگرتنەوەی قاپەکان بوو. لە پێش ئەو دەلاقەیە بوو کە چڵکاوخۆرەکان بە شان و کۆڵی یەکتر هەڵدەگەڕان. دەلاقەکان زۆر بڵند نەبوون، تا سینگی مرۆ دەهاتن. تەنیا دەستێک و ئەسکوێیان تێڕا دیار بوو.

ئاشپەز ئەسکوێیەکی زلی پێبوو و لە شێوی نێو مەنجەڵەکەی دەگێڕا. مەنجەڵەکە تا ملی

پڕ بوو لە شێو. هەڵمێکی زۆری لێهەڵدەستا. ئینجا ئەسکوێیەکی دیکەی هەڵگرت کە چوار قاپ شێوی دەبرد و دەستی بە تێکردن کرد. ئەسکوێیەکەی زۆر لە شێوەکەدا قم نەدەکرد. «یەک، دوو، سێ، چوار،...» شۆخۆف چاوی لە قاپەکان هەڵنەدەگرت تا شێوە خەستوخۆڵەکان دەستنیشان بکا. دە قاپی لەسەر سینیەکە دانان و لە کن دەلاقەکە لا کەوت. گۆپچیک لە نزیک کۆڵەگەکانەوە دەستی بۆ هەڵوەشاند: «بێرە دا، ئیڤان دنیسۆڤیچ، وەرە ئێرە!»

دەبوو قاپەکان بە هێواشی ببا. شۆخۆف چاوی لەبەر پێی خۆی بوو. ورد ورد هەنگاوی دەنا، نەکا شێوەکان بشڵەقێن، لە پەستا دەینەڕاند: «هۆک-٩٢٠، چاوت لەپێش خۆت بێ..! لاکەوە، برادەر!» بەنێو ئەو ئاپۆرەیەدا بردنی قاپەشێوێکیش بێ ئەوەی بێڵی بشڵەقێ، هەروا سووک و ئاسان نەبوو، نەخوازەڵا دە قاپ بن. گەیشتە کن ئەو مێزەی گۆپچیک خاوێنی کردبۆوە. بە شێنەیی و بێ ئەوەی دڵۆپێک شێوەی لێ بڕژێ، سینیەکەی دانا. قاپەکانی لەسەر مێزەکە ریزکردن و دووی خەستوخۆڵتری بۆ خۆی وە لایەکی نان.

یەرمۆلیڤ بە دە قاپی دیکەوە هات. گۆپچیک بە غاردان چووە کن دەلاقەکە و لەتەک پاڤلۆ چوار قاپەکانی دیکەشیان هێنان.

کیلگاس بە سینیەکی تر جیرەی نانەکەیانی هێنا. ئەوڕۆ بە پێی ئەو کارەی کردبوویان، جیرەی نانیان دەدانێ. هێندێک دووسەد گرامیان وەرگرت و هێندێکی دیکەش سێسەد گرامیان دانێ. شۆخۆف چوارسەد گرامی بەرکەوت. جیرەکەی وەرگرت. ئەفرادی دەستە تاک تاکە پەیدا بوون. دۆزینەوەی جێگا لە ئەستۆی خۆیان بوو. شۆخۆف سەرو قاپێکی دەدانێ. چاوێکی لەوان بوو و چاوی دیکەی لە سینیەکەی سەر مێز. کەوچکەکەی خۆی دەنێو قاپێکی خەستوخۆڵ نا بۆ ئەوەی ئەوانی دی لە دڵەڕاوکە رزگار بکا.

فتیۆکۆف خواردنی خۆی وەرگرت، -هەر زوو- و رۆیی. دەیزانی خۆمانەکان هیچیان لێ هەڵناوەرێ و وا چاک بوو بچێتە کن مێزەکانی دی. لەوێ رەنگبوو شتێکی وەبەر ددانی بکەوێ. کە یەکێک قاپە شێوەکەی بە نیوەچڵی جێ دەهێشت، رەوەیەک شڕەخۆری وەک ئەو بۆ خواردنی بەرماوەکە دادەوەرووکانە قاپەکە.

شۆخۆف و پاڤلۆ قاپە شێوەکانیان ژماردن. راست بوو. شێوێکی خەستوخۆڵی بۆ تیۆرین



دا بە پاڤلۆ. ئەویش بۆی لە قومقومەیەکی ئەڵمانی کرد، تا بتوانێ بە ئاسانی لە ژێر شاقەلی پاڵتۆکەیدا بۆی بباتە دەرێ.

سینیەکانیان وە زیندانییانی تر دان. پاڤلۆ بۆ خواردنی بەشە خۆراکە دوو بەرامبەرەکەی دانیشت. شۆخۆفیش دانیشت. هەر دوو بێدەنگ بوون. ساتێکی پیرۆز بوو.

شۆخۆف تەپلەکەی لەسەر کرد و لەسەر کۆشی دانا. ملاکێکی لە شێوی هەردووک قاپەکان وەردا. خراپ نەبوو. تەنانەت لەتە ماسییەکیشی تێدا دۆزینەوە. شێوی شەویان لە هی بەرچایی روونتر لێدەنا. بەیانیان زیندانی دەبوو تێر بخوا تا کاری پێ بکرێ، بەڵام شەو کە زیندانی شەکەت ببوو و یەکسەر دەچوو دەخەوت، تێرکردنی بە کەڵکی چی دەهات؟

دەستی بە خواردن کرد. سەرەتا ئاوەکەی فڕ کرد. هەموو گیانی تینی تێگەڕا.

هەناوی بۆ قووتدانی پاشماوەی شێوەکە دەیلووراند. وەی چ بەتام بوو! زیندانی تەنیا بۆ ئەو لەحزەیە دەژیا.

شۆخۆف ئێستا لەو دنیایەدا هیچ خەفەتێکی نەبوو. نە خەمی ئەو ساڵانە کە دەبوو لە زینداندا بێ، نە ئی ئەو چەند ساڵ و مانگەی بەو شێوەیە تێپەڕی کردبوو، نە بۆ ئەو یەکشەممەیەش کە لە کیسی چووبوو. ئێستا تەنیا بیری لە شتێک دەکردەوە: «هەموو شت رادەبرێ، هەموو شت تێدەپەڕێ و ئێمە دەمێنین و خوا تا سەر ئاگادارمان دەبێ».

ئاوەکەی قاپی دووەمیشی هەڵقووڕاند و خەستاییەکەی لە نێو قاپەکەی دیکە کرد. بە کەوچک بنی قاپەکەی جوان پاک کردەوە. واچاک بوو چیدی بە نیگەرانییەوە چاو لە قاپی دووەم نەبڕێ.

ئێستا دەیتوانی چاوێک بە دەوروبەری خۆیدا بگێڕی و سێرەیەکی قاپەکانی تر بدا. قاپی زیندانییەکەی لای چەپەی هێندێکی شێوی روون تێدابوو. وەی لەو بێژووانەی چێشتخانە! پیاو بڕوای نەدەکرد ئەمانە خۆشیان زیندانی بن.

شۆخۆف کەلەمەکەی لە قاپەکەی دەرهێنا. لەتە پەتاتەیەکیشی دۆزیەوە کە لە قاپەکەی سیزار دا بوو. هیچ وەک پەتاتە نەدەچوو. سەرما بردبووی، نەدەجوورا و تامێکی شیرینی

هەبوو. ماسییەکەش تەنیا هێسک و درووو و لابالێک بوو و هیچی تر. بەڵام دەبوو هێندەی مژتبان، تا تلّتەیەکیان لێ دەمایەوە. ئاوی ماسی بە تاقەت بوو. ماتڵی دەکرد، بەڵام خۆ ئەویش پەلەی نەبوو. رۆژێکی خۆشی بەسەر بردبوو. بۆ فراڤین و شێف، خواردنی زیادەی وەبەر کەوتبوو. کەواتە ئەوشۆ هەر کارێکی هەشیبوو دەبوایە پشتگوێی بخا. ئێستا ئیتر پەکی بە هیچ نەدەکەوت.

بەڵام دەبوو بچێتە لای لاتڤییەکە و تووتنی لێبکرێ، سبەینێش تووتن و مووتن لەگۆڕێ نەبوو.

شێوەکەی هەروا بە کاڵی خوارد. دوو قاپ شێو، بە نانەوە، خەزێنەیەک بوو بۆخۆی. دەبوو نانەکە دەست لێنەدا. ورگ خۆ شەرم لە پیاو ناکا. چەندی تێی باخنی ناڵێ نا، سبەش بۆ پەلکەنانێک لە حەوایەوە دەچوو. شۆخۆف بێ ئەوەی گوێ بداتە بەندییەکانی تر، شێوەکەی خوارد. بەشێکی چاکی وەگیر کەوتبوو و چاوی لە دوای بەشی کەس نەبوو. پیرەپیاویکی کەڵەگەت، زیندانیی ژمارە ب-٨١ی چاو پێکەوت. هەر کە کورسییەک چۆڵ بوو، هات لەسەری دانیشت. شۆخۆف دەیناسی. ئی دەستەی شەست و چوار بوو. لە سرەی بەشی ئەمانەتییان بەر گوێی کەوت کە دەستەی شەست و چواریان لەباتی دەستەی سەد و چوار ناردۆتە کۆمەڵگەی ئیشتراکی. ئەوانە لە بەری بەیانەوە بەو سەرماو سەخڵەتە، خۆیان هیلاک کردبوو و تێلبەندیان بە دەوری خۆیاندا کێشابوو.

***

دەیانگوت ئەو پیرەمێردە تەمەنێکی لە ئۆردووگاکاندا بەسەر بردووە و تا ئێستا وەبەر هیچ عافوویەک نەکەوتووە. کە دە ساڵی کێشاون، دە ساڵی دیکەیان بۆ بڕیوەتەوە. شۆخۆف لە نزیکەوە لێی راما. گەلێک زیندانی پشتیان چەمابۆوە، کەچی ئەو پیرەمێردە وەکو خەدەنگ، قیت و قنج رادەوەستا. کە لە پشت مێزەکە دانیشت، دەتگوت کورسییەکەی بستێک لە هی هەمووان بلّندترە. لە مێژساڵ بوو ئیدی حەوجێی بە سەرتاشین نەبوو. هێند خۆشی رابواردبوو چڵەموویەکی بە سەریەوە نەمابوو. ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەبوو و چاوی بڕیبووە خاڵێک لە ژوور سەری شۆخۆفەوە، خاڵێکی وا کەس نەیدەزانی لە کوێیە. شێوە روونەکەی هێدی هێدی بە کەوچکێکی داری سواو دەخوارد. ئەو، وەک ئەوانی دی سەری نەدەبردە سەر قاپەکە. کەوچکەکەی تا دەمی بەرز



دەکردەوە. نە لە ریزی سەرەوە نە لە ریزی خوارەوە، تاقە ددانێکی لە زاریدا نەمابوو. بە پووکە سواوەکانی نانەکەی دەجاوی. چرۆچاوی گنجاوی بوو، بەڵام زۆریش نەتوڵخابۆوە، پێستی روخساری گەنمڕەنگ بوو و دەتگوت لە بەرد داتاشراوە. ئەو دەستە خەپلە و قەڵشیو و گڕانەی ئاسەواری ساڵیانی ساڵ بێگاریان پێوە دیار بوو. پێدەچوو تاکە یەک کەڵکەڵەی لە مێشکیدا بێ، ئەویش ئەوەبوو قەت بە چۆکدا نەیە. وەک ئەوانی دی نانەکەی لەسەر مێزە چڵکن و پیسەکە دانەنا. کوتە پەڕۆیەکی خاوێنی، کە هەزاران جار شۆردبووی، لەسەر مێزەکە پانڕا کرد و نانەکەی لەسەر دانا.

***

شۆخۆف چیتر نەیدەتوانی هەروا لەوێ دابنیشێ و زەق زەق چاو لەو پیرەمێردە ببڕێ. کە نانەکەی خوارد، کەوچکەکەی لە تەنیشتێکی چەکمەکەی نایەوە. تەپلەکەی هێنا سەر برۆی. هەستا، نانی خۆی و سیزاری دەست دایە و وەدەرکەوت. دەبوو بە دەرگاکەی تردا بڕواتە دەر. لە خزمەتکارەکان دوویان لەبەر دەرگە راوەستابوون. ئەوانە دەرگەوان بوون و کە بەندی وەدەر دەکەوت دەرگاکەیان دادەخستەوە.

شۆخۆف تێرو دڵخۆش لە خواردنگە هاتە دەرێ. گەرچی زۆری نەمابوو چراکان بکوژێننەوە، بەڵام بڕیاری دا بچێتە لای لاتڤییەکە. یەکسەر رووی لە خەوگەی ژمارە حەوت کرد. مانگ لە ئاسماندا دەدرەوشایەوە. سپی و خاوێن بوو، دەتگوت لەو ئاسمانە رەشەی شەو بەرجەستە بۆتەوە. ئەستێرەکان لە ئاسمانی ساودا تیشکیان داویشت. ئێستا ئیتر هەر ئەوەندەی پێمابوو رابوەستێ و تەماشای ئاسمان بکا. سوور دەیزانی هەوا ساردتر دەبێ. کارگەرێکی ئازاد گوتبووی شەو سەرما دەگاتە سی پلەی ژێر سفرەوە و تا بەرەبەیانی خۆی لە چل پلەش دەدا.

لە دوورەوە گڕەی تراکتۆرێک دەهات. شۆفلێک بۆ لێدانی جادە خەریکی هەڵکۆڵینی زەوی بوو. کەیەکێک لە ئۆردووگادا هاتوچۆی دەکرد یان غاری دەدا، دەنگی کرپەی پێی دەهات. بای نەدەهات.

شۆخۆف وەکو جاران دەبوو هەر پەرداخە تووتنەی بە روبلێک بکرێ. لە دەرەوە پەرداخی بە سێ روبڵ بوو، ئەگەر تووتنەکە خۆش با گرانتریش بوو. نرخی کەلوپەل لە ئۆردووگا لە

هی شوێنانی تر جیا بوو؛ لێرە کەس ئاشتەبایەکی شک نەدەبرد. پارە بە زەحمەت پەیدا دەبوو، ئەوانەی هەشیانبوو، ژمارەیان نەدەگەیشتە پەنجەی دەست. لە ئۆردووگای تایبەت، قرۆشێکیشیان نەدەدایەی. (لە ئوست- ئیژما بە سێ مانگ جارێک سی روبڵیان دەدانێ) ئەگەر لە دەرەوەشڕا دراویان بۆ رەوانە کردبای، لە حیسابێکدا بە ناوی تۆوە لای خۆیان گلیان دەدایەوە کە مانگێ جارێک دەتتوانی بەو پارەیە سابوونی بۆنخۆش و غورابیی برشاوی و جغارەی «پریما» بکڕی. دەبوو هەر ئەو کەلوپەلانەی فرۆشگا بکڕی و پێش کڕینیش دەبوایە چ شتێکت دەوێ، بە فەرماندەیی رابگەیەنی. ئەگینا دراوەکەت دەفەوتا و حیسابەکەیان بەتاڵ دەکردی. شۆخۆف هەر چۆنێک بوایە پارەی پەیدا دەکرد. لەو کۆنە پەڕۆیانەی موشتەرییەکانی بۆیان دێنا، سۆلی دەدروون (جووتی بە دوو رووبڵ) یان پەستەیەکی پینە دەکرد (مزەکەی بە پێی کەم و زۆریی کارەکە بوو).

***

خەوگەی حەوت لەگەڵ خەوگەکەی ئەوان جیاوازی هەبوو. ئەو خەوگەیەی شۆخۆف لێی دەخەوت کرابووە دوو قاوشی گەورە. بەڵام خەوگەی ژمارە حەوت راڕەوێکی درێژ و دە هۆدە بوو. هەر هۆدەیەک، بە حەوت تەخت و ئاودەستخانەی سەربەخۆوە، هی دەستەیەک بوو. خزمەتکاری خەوگە و هونەرمەندان هەرکام ژووری تایبەت بە خۆیان هەبوو.

شۆخۆف چووە لای لاتڤییەکە. لاتڤی لەسەر تەختێکی ژێرەوە راکشابوو، لاقی بە شیشی تەختەکە هەڵپەساردبوون و دەگەڵ یەکێکی پەنا خۆی دەدوا. شۆخۆف لە کنی دانیشت و سڵاوی کرد. لاتڤی سڵاوەکەی لێ ئەستاندەوە، بەڵام قاچی نەهێنانە خوار. لەو هۆدە بچووکەدا هەموو گوێقوڵاغ بوون بزانن شۆخۆف بۆچی هاتووە. بەڵام شۆخۆفیش و لاتڤییەکەش دەیانزانی چ بکەن. بۆیە شۆخۆف نەهاتە سەر ئەو باسە. («حاڵ و وەزعەکە کووە؟»، «خراپ نییە.» «ئەورۆ هەوا زۆر سارد بوو.» «وابوو.»)

راوەستا هەتا ئەوانی دی مژوولی قسان ببنەوە. لە بارەی شەڕی کۆریاوە داخافتن. باسی ئەوەیان دەکرد تۆ بڵێی بەخۆ تێوەردانی چین جەنگێکی تری جیهانی روونەدا؟ شۆخۆف چووە بن گوێی لاتڤییەکە و لێی پرسی: «تووتنت هەیە؟»

«ئەی چۆن نیمە!»



«دەتوانم ببینم؟»

لاتڤییەکە قاچی بەردانەوە و لە عەرزی دانان. هەستا. ئەو لاتڤییە بەڕاستی رژد و قرنیس بوو. کە تووتنی تێدەکرد بۆ یەک دوو پەلکی زیاد نیوەعومر دەبوو.

جۆرکەکەی نیشانی شۆخۆف دا و زارکەکەی بۆ کردەوە.

شۆخۆف هێندێکی دەرهێنا و لەسەر لەپی دەستی رۆکرد. هەر لە هی جارەکەی دی بوو، بە هەمان رەنگ و بۆوە. بردیە بەر لووتی و بۆنی پێوەکرد. بەڵێ خۆیەتی، بەڵام بە لاتڤییەکەی گوت.

«دەڵێی لەوی جاران نییە؟»

لاتڤی بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە: «هەر هەوە، هیچ فەرقی نییە، هەمیشە یەک جۆرە.»

شۆخۆف گوتی: «باشە پەرداخێکم بدەیە؛ ئەگەر خۆش بوو لەوانەیە پەرداخێکی دیکەش ببەم.»

سەگبابە پەرداخەکەی چاک نەدەپەستاوت. بێ ئەوەی تووتنەکە بشێلێ تێی دەکرد. لاتڤییەکە جۆرکێکی دیکەی لە ژێر بالیفەکەی دەرهێنا، لەوی دی پرتر بوو. پەرداخێکیشی لە چەمەدانییەکە دەرهێنا. پەرداخەکە پلاستیک بوو، بەڵام بە قەد پەرداخی شووشە تووتنی دەبرد. تووتنی تێکرد.

شۆخۆف گوتی: «بیشێلە!» ئینجا ئەنگوستی بۆ شێلانی تووتنەکە رە زگ پەرداخەکە نا.

لاتڤییەکە کە دیسان دەهری ببوو گوتی: «خۆم دەزانم، دەزانم چۆنی تێبکەم.» پەرداخەکەی کێشایەوە و بە قامک تووتنەکەی نێوی شێلا، بەڵام توندی نەدەشێلا. ئینجا تووتنی دیکەی دەسەر کرد.

لەو کاتەدا شۆخۆف قۆپچەی کەوایەکەی ترازاندن. لەناو بەری کەوایەکەدا ئەسکیناسێکی دوو روبڵی شاردبۆوە. ئەسکیناسەکەی بە بن بەرە پاڵتۆکەدا رەپاڵ نا تا گەیشتە راستی کونێک لە شوێنێکی دیکەی پاڵتۆکەیدا کە سەری دادروبوو. تەقەڵەکانی بە نینۆک هەڵوەشاندن. ئەسکیناسەکەی درێژاو درێژ نوشتاندەوە و لە کونەکەوە دەری کێشا. ئەسکیناسێکی شڕ و کاڵ بۆوە بوو.

***

یەک لە زیندانییەکان بەقەو دەیگوت: «پێت وایە ئەو زۆڵە سمێڵ بابڕە[١٤] لە مۆسکۆ سکی بە تۆ دەسووتێ؟ ئەو، بەزەیی بە برای خۆشیدا نایە، نەخوازەڵا بە کرمێکی وەک تۆ!»

شتێکی باشی ئۆردووگای تایبەت ئەوە بوو زیندانی دەیتوانی هەرچی حەزی لێیە بیڵێ. لە ئوست-ئیژما بە چپە بە یەکێکت گوتبا لە دەرەوە شەمچە وەگیر ناکەوێ، دووساڵی دی حەپسیان بۆ زیاد دەکردی. بەڵام لێرە هەرچی پێت خۆش با دەتتوانی بە دەنگی بەرز بیڵێی. سیخوڕەکان گوێی خۆیان داخنی و مەئمووری ئاسایشیش خۆیان لە کەس نەدەگەیاند. گرفتەکە لەوەدابوو پیاو دەرفەتی قسەکردنی نەبوو.

***

شۆخۆف بە منگە و بۆڵەوە گوتی: «تەح، برا خۆ هیچت تێنەکرد.»

لاتڤییەکە گوتی: «باشە، باشە.» ئەمەی گوت و سەری پەرداخەکەی پڕ کرد.

شۆخۆف کیسەکەی خۆی لە ژێر کەوایەکەی دەرهێنا و پەرداخە تووتنەکەی وێ گێڕا. گوتی: «زۆر چاکە، یەکی دیکەشم بۆ تێکە.» تاقەتی ئەوەی نەبوو تووتنەکە تاقی بکاتەوە. حەزی نەدەکرد یەکەم جغارەی بە پەلەپەل بکێشێ.

لەسەر ئەو پەرداخەش مشتومڕی لەگەڵ کرد و ئەویشی وە کیسەکەی گێڕا. ئەسکیناسە دوو روبڵییەکەی دا بە کابرا، سەری لەقاند و وەدەرکەوت. ئینجا بە گورگەلۆقە بەرەو خەوگە بۆوە بۆ ئەوەی خۆ بگەیەنێتە سیزار و شتومەکەکەی.

سیزار لەسەر تەختی خوارەوە دانیشتبوو. خواردەمەنییەکانی لەسەر تەخت و چەمەدانییەکە بڵاو کردبوونەوە و لەو تاریکاییەدا بە سەری دەکردنەوە. تەختەکەی شۆخۆف بەری تیشکی چرای بن میچی گرتبوو. شۆخۆف داهاتەوە و بە نێوان تەختی گەمیەوان و سیزار دا نانەکەی وێ دا. گوتی: «بەشی تۆیە، سیزار مارکۆڤیچ.» پێی خۆش نەبوو سیزار وا بیر بکاتەوە کە لە هەمبەر گرتنەوەی سڕەدا چاوی لە نانەکەیەتی. لەتێک لەو نانە مافی خۆی بوو، بەڵام دوای هەشت ساڵ چەرمەسەریی ئۆردووگاش، هێشتا



نەیدەتوانی دەست بۆ کەس پان بکاتەوە. ساڵ بە ساڵ زیاتر هەستی بەوە دەکرد کە پێویستی بە هیچ نییە. بەڵام چاوی خۆی پێ رانەدەگیرا. وەک هەموو زیندانییەک چاوی لە چاوی هەڵۆ تیژتر بوو، بە تیلەچاوێک سێرەی لەو خواردەمەنییانە گرت کە سیزار بە سەر تەخت و چەمەدانییەکەیدا بڵاوکردبوونەوە. هەرچەند هێشتا کاغەزە تێوەرپێچراوەکان لێ نەکرابوونەوە و سەری تۆربەکانیش ئاوەڵا نەکرابوون، بەڵام شۆخۆف بەو تیلەچاوە و بە بۆن پێوە کردنێک، زانی سیزار، سۆسیس و سیری وشککراوە و ماسییەکی گەورە و دووگی بەراز و کولیچە و شتێکی وەک رۆنی کەرە و جغارە و تووتنی پایپ و شتی تریشی بۆ هاتوون.

شۆخۆف لەو کاتەدا کە داهاتەوە نانەکە بداتە سیزار، ئەوانەی هەموو دیتن. سیزار وەک سەرخۆشانی لێهاتبوو. (ئەو کەسانەی شتیان بۆ دەهات ئاغڵەبە تووشی ئەو حاڵەتە دەبوون) گوتی: «با بۆ خۆت بێ، ئیڤان دنیسۆڤیچ.» شێوەکەی سیزاری خواردبوو، ئێستاش وا بەشە نانەکەی، ئیتر ئەوە زیادە خۆراکێکی تەواو بوو. شۆخۆفیش لەوە زیاتری چاو لە سیزار و شتەکانی نەبوو. ئیتر ئەو خەیاڵەی لە سەری خۆی وەدەرنا کە لە شەوچەلەکانیش وە بەردەمی بکەوێ. پیاو نابێ بە خۆڕایی بەڵێنی بە ورگی خۆی بدا. چوارسەد گرام نانی خۆی هەبوو، ئێستا جیرەی نانی سیزاریشی هاتبووە بان، جگە لەوە لەتە نانێکیش هەروا لە دۆشەگەکەدا بوو! نانەکەی سیزاری هەر ئەو دەم دەخوارد، بەیانیش نانی وەردەگرت و هەندێکی لێ دەگەڵ خۆی دەبردە سەر کار. ئاوا نەبا دەفەوتای! لەتە نانەکەی ناو دۆشەگیش با هەر لەوێ بایە. چاک بوو سەری کونەکەی تەقەڵ دابوو. ئەوە نییە نانی بەندییەکی دەستەی حەفتاو پێنجیان دزیبوو! پیاو شتێکی لێ ون ببا تازە ئاوەو ئاو دەچوو.

هەندێ کەس وایاندەزانی ئەوانەی لە دەرەوە شتیان بۆ دێ لە هیچیان پەک ناکەوێ. بەڵام لە راستیدا وا نەبوو، بە چاوترووکانێک خواردەمەنی دەبڕا. زۆر زیندانیی وا هەبوون لە بۆسەدا بوون یەکێک شتی بۆ بێ و قاپە شێوێکیان وەگیر بکەوێ. ئی واش هەبوون قوونچکە جغارەیان هەڵدەگرتنەوە. یەکێک شتی بۆ هاتبا دەبوو بەشی پاسەوانانیش بدا. سەردەستە و خزمەتکاریش هەروەتر. جاری وابوو یەکێک کە شتی بۆ دەهات، لێی شرتوگوم دەبوو و تا چەند حەفتە نەیدەدۆزیەوە. ئەگەر لە ترسی جەردە و موفەتیشەکان، شتەکانت لە عەمبار دانابان -سیزار بێگومان سبەینێ پێش سەرژمێری،

پرێسکەکەی دەبردە عەمبار- عەمباردارێش بەشی خۆی دەویست، ئەگەر نەشتدابایە هێندەی بەشەکەی یان بە زیادەوەش، چکە چکە، لێی دەقاچاند. کێ دەیتوانی هەموو رۆژێ لەوێ دابنیشێ و سێسەرە لەو جرجە هەڵنەگرێ کە دەست لە خواردەمەنییەکان نەدا؟ دەبوو شتێکیش بدەیە ئەو کەسەی سرەی بۆ دەگرتی، ئەگەر ویستبات کابرای جلشۆرخانە ژێرکراسی خۆت وێ بداتەوە، دەبا سمێڵی ئەویش چەور بکەی. سەرتاشیش چەند قل جغارەی دەویست، دەنا لە جیاتی ئەوەی تیغەکە بە پارچە رۆژنامەیەک بسڕێتەوە، لەسەر چۆکتی هەڵدەسوو. خۆ کارمەندانی بەشی رۆشنبیریش دەبوو نامەکانت بۆ رابگرن. ئەگەر ویستباشت لەسەر تەختەیەک پاڵ بکەوی خۆ نەدەکرا بە دەستی بەتاڵ بچیە دەرمانگا. کەسی تەنیشتیشت کە چەمەدانیی تەختەکەتان پێکەوە بوو، وەکو گەمیەوان و سیزار کە بە هەردووکان چەمەدانییەکیان هەبوو، دەبوو شتێکی بدەیەی، دەنا زەق زەق لە دەمتەوە رادەما و پارووەکانی دەژماردی. کوا پیاو بەخۆی دەوەستا هیچی نەداتێ؟

ئی واش هەبوون چاویان بە شتی کەس هەڵنەدەهات. با ئەو جۆرە جۆرانە تا دەقەڵشن ئێرەیی بە خەڵک بەرن. شۆخۆف لە ژیانی خۆیدا هەموو جۆرە بنیادەمێکی دیبوو و لەو کەسانە نەبوو کە هەمیشە چاویان لە دووی ماڵی خەڵکییە.

***

چەکمەکانی داکەندن و وە سەر تەختەکەی کەوت. تیخەڵە پۆڵایەکەی لە نێو دەستکێشەکە دەرهێنا و لێی ورد بۆوە. سبەینێ دەبوو بەردە هەسانێک بۆ تیژکردنی تیخەڵەکە پەیدا بکا. ئەگەر چوار پێنج رۆژ، بەیانیان و شەوانە سووبایەوە دەبوو بە شفرەیەکی تیژ و نووک خواری پینەدۆزی. بەڵام جارێ دەبوو لە جێگایەکی نێو دۆشەگ و کەلێنی تەختەکەیدا بیشارێتەوە، تا گەمیەوان نەهاتبوو و تەختی بنەوە چۆڵ بوو.- نەیدەویست بڕڕەی دۆشەگەکەی بەسەردا بوەرێنێ- دۆشەگە قورسەکەی هەڵدایەوە و تیخەڵەکەی شاردەوە. ئالیۆشای باپتیست و دوو ئەستوونییەکان لە سەر تەختەکانیان بوون. بەڵام ئەوان جێی متمانە بوون.

فتیۆکۆف هاتەوە خەوگە. دەگریا. کوورِ ببۆوە و خوێنی بە لالغاوەیدا هاتبووە خوارێ. بێگومان دیسان لەسەر رفاندنی قاپە شێوێک تێهەڵدانی خواردبوو. بە پێش جەماوەرەکەدا تێپەڕی، بەڵام تەماشای کەسی نەکرد، تەنانەت فرمێسکەکانیشی لە کەس



نەشاردنەوە. وەسەر تەختەکەی کەوت و دەموچاوی لە دۆشەگەکەدا نوقم کرد.

پیاو بەخۆی نەبوو زگی پێدەسووتا. ئەو کابرایە هێند گێل و کەمتەرخەم بوو زەحمەت بوو سەری ساغ لە زیندان بباتە دەر.

ئینجا گەمیەوان هاتەوە. کەیفی ساز بوو. چادانێک چای بە دەستەوە بوو. لەو چایە نەبوو کە لە ئۆردووگا دەیاندانێ. بۆ خەوگە لە دوو بەرمیلدا چایان لێدەنا. چاش چ چا، قوراوێکی شلەتێن بوو، رەنگی لە چا دەچوو بەڵام تامی تەختەی رزیوی بەرمیلەکەی لێدەهات. تەنیا بێ داشدارەکان و زیندانییە چارەڕەشەکان دەیانخواردەوە. گەمیەوان بەشی دێمە چایەک چای چاکی لە سیزار وەرگرتبوو و ئاوی کولێوی تێکردبوو. دڵی خۆش بوو و چادانەکەی لەسەر چەمەدانیی تەختەکەی دانا. گوتی: «هێندەی نەمابوو ئاوی کولێوم وەسەر دەستی بگەرِێ.» پێدەچوو پێی ناخۆش نەبێ دەستی بسووتێ.

سیزار خەریک بوو خواردەمەنییەکانی لەسەر چەند پەڕە کاغەز بڵاو دەکردنەوە. شۆخۆف لە درزی تەختەکەیەوە دەیدی. دۆشەگەکەی دانایەوە تا نەیبینێ. بەڵام چما سیزار وازی لێ دێنا؟

سیزار هەستا و سەری بردە پەنا تەختی شۆخۆف و چاوێکی لێداگرت و گوتی: «دەڵێم شۆخۆف... ئاواڵی چاک بە و ئەو «دە رۆژ»ەتم بە قەرز بدەرێ. دەمدەیەی؟» مەبەستی قەڵەمبرە بچووکەکەی شۆخۆف بوو. (لە دەست هەر کەسیان گرتبا، دە رۆژ زیندانی تاکەکەسی مسۆگەر بوو.) شۆخۆف ئەویشی لە ژێر دۆشەگەکەیدا شاردبۆوە. هەر هێندەی دوو گرێی پەنجەیەک دەبوو، بەڵام دووگی بەرازی وەک پەنیر قاش دەکرد. دەسکاری خۆی بوو و دایمە خاوێنی دەکردەوە. دەستی لە بن تەختەکەی راکرد و قەڵەمبرەکەی دەرهێنا. سیزار سەرێکی لەقاند و بزر بوو.

ئەو قەڵەمبرەش نانی پێ پەیدا دەبوو. بەڵام راگرتنی، مەترسیی گیرانی پێوە بوو. ئەگەر یەکێک خواستبایەوە تا سۆسیس یان شتێکی لەو بابەتەی پێ ببڕێ، مەگەر دڵی لە بەرد با دەنا هەروا بە دەستی خاڵی نەیدەهێنایەوە.

ئێستا سیزار بۆ چەقۆش قەرزاری بوو. شۆخۆف دوای ئەو سەودا بە ڕێژەوە، کیسە تووتنەکەی دەرهێنا. بەشی قەرزەکەی لێ هەڵگرت و دایەوە ئوستوونییەکان کە تەختەکەیان بەرامبەری تەختی ئەو بوو، سوپاسی کردن.

یەکیان پەل بۆوە و بزەیەکی بۆ هاوڕێیەکەی کرد و پێکەوە سرتوخورتێکیان کرد. ئینجا بۆ تاقیکردنەوە سەرو جغارەیەکیان لێ تێکرد. خۆ لە تووتنەکەی خۆیان ناخۆشتر نەبوو. کەواتە وا باش بوو بیئازموون؛ جێی خۆی بوو شۆخۆفیش جغارەیەک بۆ خۆی هەڵپێچێ. بەڵام هەستێکی دەروونی پێی دەگوت پشکنینی شەوانە نزیک بۆتەوە. سەرەوبەندی پەیدابوونی پاسەوان بوو. بۆ جغارە کێشان دەبوو بچێتە ڕاڕەوەکە، بەڵام حەزی نەدەکرد لەو جێگا گەرمەی بێتە دەرێ.

خەوگە یەگجار سارد بوو، سەهۆڵی قولینچکی دیواران هێشتا نەتوابوونەوە. ئەو دەمانە پیاو دەیتوانی خۆی ڕابگرێ، بەڵام پاش چەند کاتژمێری دی دەبوو بە سرسڕخانە.

گوێچکەیەکی نانەکەی پچڕی، لە هەمان کاتیشدا بێ ئەوەی بیەوێ گوێی لە قسەکانی سیزار و گەمیەوان دەبوو کە چایان دەخواردەوە و داخاوتن.

«تا پێت دەخورێتەوە بخۆوە، گەمیەوان؛ شەرم مەکە. لەو ماسییە بخۆ، سۆسیسیش هەیە!»

«زۆر سوپاس، ئەگەر ئیشتیام لێبێ دەخۆم.»

«دەی ڕۆنی کەرە لە نانەکەت هەڵسوو، ئەمەیان نانی فەڕەنسەیی ئەسڵە کە لە مۆسکۆڕا بۆیان ناردووم.»

«پیاو باوەڕ ناکا ئێستاش لەو نانانە هەبن. ئەو جۆرە شتانە ئەو کاتەم دەخەنەوە یاد کە لە ئارخانگل بووم...»

لە قاوشەکەی ئەواندا، کەس گوێی لە دەنگی کەس نەدەبوو. -دووسەد کەس پێکەوە چەقەچەقیان بوو- بەڵام شۆخۆف زرینگەی چەکوچکەکانی دەرەوەی بیستن. پاسەوانێکی لوت زل هاتە ناو خەوگە. یەکی خرپلەی سوورکارە بوو. کاغەزێکی بە دەستەوە بوو. دیار بوو بۆ بردنی چەند کەس بۆ دەرەوە یان گرتنی ئەوانەی جغارەیان کێشابوو، نەهاتووە. لە یەکێک دەگەڕا. چاوێکی لە کاغەزەکە کرد و گوتی: «دەستەی سەد و چوار لە کوێیە؟»

«لێرەیە.»

ئوستوونییەکان جغارەکانیان شاردنەوە. بە دەست دووکەڵەکەیان بە هەوادا بڵاو کردەوە.



«کوا سەردەستەکەتان؟»

تیۆرین پێیەکی لەسەر تەختەکە هێنایە خوارێ و گوتی:

«چت دەوێ؟»

«دوو کەس لە ئەفرادی دەستەکەت دەبوایە ڕاپۆرتی جلە زیادەکانیان بنووسن، کوا ڕاپۆرتەکانیان؟»

تیۆرین بێ ئەوەی بپەشۆکێ، گوتی: «دەینووسن.»

دەبوو تا ئێستا نووسیبایان.»

ئەمانە خۆ خوێندەوارێکی وا نین، تا دێڕێک دەنووسن قیڕ سپی دەبێ.»

(لەگەڵ سیزار و گەمیەوانی بوو؛ ئەو تیۆرینەش مرۆیەکی سەیر بوو، قەت بۆ وەڵام تێنەدەما) «ئەوجار، بە چی بنووسن؟ نە قەڵەم هەیە و نە کاغەز.»

«بۆ نەتداونێ؟»

«لە کوێ بێنم؟ قەڵەم و کاغەز نادەنە کەس.»

پاسەوانەکە گوتی: «گوێ بگرە، وا چاکە ئاگات لە دەمی خۆت بێ، دەنا لە کونە ڕەشت دەکەم، ها» بەڵام هەڵنەچووبوو «ئەو ڕاپۆرتانە دەبێ بەری بەیانی بدرێنە پاسەوانی، هەرکەس بەرگی زیادی هەیە دەبێ بیداتە عەمباری کەلو پەلی زیادە. تێگەیشتی؟»

«بەڵێ تێگەیشتم.»

(شۆخۆف لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا دیارە گەمیەوان ڕزگاری بوو.» گەمیەوان وەک لە گوێی گادا خەوتبێ، بە سەرهاتی خۆی بۆ سیزار دەگێڕایەوە و سۆسیسی دەخوارد.) پاسەوانەکە گوتی: «شتێکی دی، زیندانیی ژمارە س-٣١١ لێرەیە؟ هی دەستەی ئێوەیە؟»

تیۆرین بۆ چاوبەست کردنی گوتی: «دادەی با چاو لە پێرستەکە بکەم. پیاو کوا ئەو هەموو ژمارە نەفرەتییانەی لە بیر دەمێنن؟» خەریک بوو خۆی دەگنخاند تا بۆ سەرژمێریی شەوانە بانگیان بکەن، ئەودەم لەوانەبوو گەمیەوان هیچ نەبێ ئەوشۆ لە زیندان قوتار بێ.

کابرای پاسەوان هەرای کرد: «بیۆنۆڤسکی لێرەیە؟»

گەمیەوان لەسەر تەختەکەیڕا وەڵامی دایەوە: «چی بووە؟ بەڵێ من لێرەم.» (ئیشەکەی تێک دا.)

«تۆ بیۆنۆڤسکی؟ س-٣١١ی؟، زۆر چاکە وەدوام کەوە!»

«بۆ کوێ؟»

«بۆ خۆت دەزانی.»

گەمیەوان هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە بۆڵە بۆڵ بۆ ڕۆیشتن خۆی ئامادە کرد. ئاژۆتنی پاپۆڕێکی شەڕکەر لە دەریایەکی ئەنگوستەچاوی بە فەرتەنەی پێ لەوە ئاسانتر بوو لە گەرمەی قساندا لەگەڵ ئاواڵەکەی ناچار بێ بچێتە سلوولێکی ساردو سڕ. بە منگە منگ گوتی: «چەند ڕۆژ؟»

«دە ڕۆژ! بجووڵێوە، بڕۆ دەی!»

لەو جەنگەیەدا خزمەتکارەکان کردیانە هەرا: «هەموو بۆ دەرەوە! بۆ پشکنینی شەوانە، هەموو بچنە دەرەوە!»

کەوابوو پاسەوانەکانی مەئمووری پشکینی شەوانە هاتبوونە خەوگە. گەمیەوان سەیرێکی تەختەکەی کرد. بڵێی بتوانێ پاڵتۆکەی لەگەڵ خۆی ببا؟ بەڵام لە زینداندا جگە لە کەوا هیچی تریان لەبەردا نەدەهێشت. کەواتە وا چاک بوو هەروا بچێ. گەمیەوان لەوانەیە پێی وا بووبێ ڤۆلکۆڤی لێی خۆش دەبێ. بەڵام ڤۆلکۆڤی قەت لەکەس خۆش نەدەبوو، بۆیە بۆ چوونە زیندان خۆی ئامادە نەکردبوو. تووتنی لەناو کەوایەکەیدا نەشاردبۆوە و ئەگەر ویستبای هێندێکی لە مشتی بگرێ، بەخۆڕایی بوو. لە کاتی پشکنیندا یەکەم جێ دەستی دەگەڕان. سەرەڕای ئەوە کاتێ کڵاوەکەی لەسەر دەنا، سیزار یەک دوو جغارەی دانێ.

گەمیەوان شپرزە و داماو چاوێکی لە هاودەستەیەکانی کرد، گوتی:

«ئێ، خواحافیز، هاوڕێیان.» ئینجا وە دوای پاسەوانەکە کەوت.

هەندێکیان بە دوایدا هاواریان کرد: «خەمت نەبێ! لەبەریان دامەنوێنە!» هەر دەبوو شتێک بڵێن.



***

زیندانەکە، ئەفرادی دەستەی سەد و چوار، خۆیان دایاننابوو و دەیانزانی چتۆ شوێنێکە. دیواری بەرد، عەرزی چیمەنتۆ، بێ پەنجەرە... سۆبەی هەبوو، بەڵام تینەکەی تەنیا سەهۆڵی دیوارەکانی پێ دەتوایەوە و عەرزەکە پڕ دەبوو لە قۆرتی ئاو. لەسەر تەختێکی ڕەقوتەق، بەبێ ڕایەخ و نوێن دەخەوتی و تا بەیانی دانەچۆقەت بوو. ڕۆژێ سێسەد گرام نان و بە سێ ڕۆژ جارێک شێوی گەرمیان دەدایەی.

دە ڕۆژ! ئەگەر دە ڕۆژ لە حەپسی تاکەکەسیدا بای و بەرگەت گرتبا، بێگومان ئیتر ساخلەمیی خۆت لە دەست دەدا. تووشی سیل دەبووی و تا دەمردی لەسەر تەختی نەخۆشخانە دەتلایەوە. هەرکەس پازدە ڕۆژ گیرابا لە سلوولەوە یەکسەر دەیانبردە گۆڕستان.

مرۆڤ هەر ئەوەی کە لە خەوگە دەخەوت، بەختەوەر بوو و دەبوو شوکرانەبژێری ئەو نیعمەتە بێ.

***

چاودێری خەوگە نەڕاندی: «زوو بن، بڕۆنە دەرێ! تا سێ دەژمێرم، ئەوی لە ژوورێ مابێ ناوەکەی دەدەمە هاوڕێ پاسەوان!»

ئەو سەگبابەش لە زۆڵ و دار لە قوون کوتراوەکان بوو. شەوانە کە لە خەوگە لەگەڵ خەڵکەکە دەخەوت قڕوقەپی دەکرد، کەچی ئێستا وەک دەمڕاستان کەشوفشی دەکرد و فەرمانی دەدان. بۆ زیندانییەکانی تێدەچاند یان خۆی بە گژیاندا دەهات. قامکێکی لەشەڕدا پەڕیبوو، لەبەر هەندێ خۆی کردبووە «کەم ئەندام». بەڵام لە چڕو چاوی دەخوێندرایەوە پیاوکوژە. لە ڕاستیشدا پیاوکوژ بوو. فایلی جینایەتی هەبوو. بەڵام بەندی چواردەی ماددەی پەنجا و هەشت ئەویشی گرتبۆوە و ناردبوویانە ئەو ئۆردووگایە.

پەکی بە کەس نەدەکەوت. خێرا ژمارەی پیاوی یادداشت دەکرد و دەیدایە پاسەوانەکان، ئەودەم دوو ڕۆژ گیران بە کاری ڕۆژانەوە چاوەنۆڕی بوو. بۆیە زیندانییەکان بێ سێ و دوو لێکردن دەرپەڕین و وەک ورچان خۆیان لە تەختەکانی سەرێڕا فڕێ دا. هەموویان هرووژمیان کردە دەرگە تەسکەکەی خەوگە.

شۆخۆف خۆی لە تەختەکە فڕێ دا و چەکمەکانی دە پی کردن. جغارەکەی کە تازە هەڵیپێچابوو، لە نێو ئەنگوستان نا. هەر ئەوەندە بوو بۆ مژێکی سوێی نەدەبۆوە. خەریک بوو بڕوا کە چاوی بە سیزار کەوت، زگی پێی سووتا. شۆخۆف هەر لە خۆوە تووشی ئەو هەستە بوو. ئەو کابرایە بەو هەموو خوێندەواری و ئاگادارییەی خۆیەوە هەڕەی لە بڕەی ژیان نەدەکردەوە. دەبوو پێش پشکنینی شەوانە خواردەمەنییەکانی بە عەمبار سپاردبان و هێندەی خۆ پێوە نەخافڵاندبان. تازە هیچی پێنەدەکرا. ئەگەر ئەو تۆربە سەگباب خێوەی لەگەڵ خۆی بردبا، دەبوو بە گەپجاڕی پێنجسەد زیندانی. ئەگەر هەروا لەوێشی بەجێ هێشتبان، هەرکەس یەکەوجار گەڕاباوە خەوگە، زەبری خۆی لێدەدان. (لە ئوست–ئیژما حاڵەکە لەوەش خراپتر بوو، جەردەی وای لێبوون هەمیشە پێش خەڵک خۆیان دەگەیاندەوە خەوگە و چەمەدانییەکانیان تاڵان دەکردن.)

شۆخۆف دیتی سیزار لە ئارەقەدا خووساوە. بەڵام تازە زۆر درەنگ ببوو. سۆسیس و دووگە بەرازەکەی لە گیرفان و بن شاقەلان ئاخنین، بۆ ئەوەی هیچ نەبێ ئەوانە لەگەڵ خۆی ببا.

شۆخۆف بۆ ئەوەی یارمەتییەکی دابێ گوتی: «جارێ مەڕۆ تا ئاخر کەس دەچێتە دەرێ، سیزار مارکۆڤیچ، بڕۆ سەر تەختەکەت، لەوێ خۆت مات بکە هەتا پاسەوان و خزمەتکارەکان دێنە زگت. ئەودەم بڵێ نەخۆشم. من دەچم لە پێشەوەی ریزەکە جێگا دەگرمەوە و بەر لە هەمووانیش دێمەوە خەوگە...» ئەمەی گوت و غاری دا دەرێ.

هەر چۆنێ بوو دڕی بە ئاپۆرەکە دا (دەبوو ئاگای لە جغارەکەشی بێ پان نەبێتەوە.) بەڵام لە ڕاڕەوەکەدا کە دوو قاوشەکەی خەوگەی تێک دەکردنەوە، کەس بۆ چوونە دەرەوە تاڵووکەی نەبوو (ئەو نامەردانە دەستی شەیتانیشیان لە پشتەوەڕا دەبەست). هەموو وەک مردوو خۆیان بە دیوارەکانی هەر دوو لاوە نووساندبوون، لەبەر دەرگەی دەرێ تەنیا ڕێگای یەک کەس مابۆوە. کەس بەتەما نەبوو بچێتە دەرەوە. بە درێژایی ڕۆژ لەبەر ئەو سەرماو بەستەڵەکە بوون و ئێستا کەس کەیفی لەوە نەبوو دە دەققەی تریش لەبەر سەرما ڕابوەستێ. ئەگەر یەکێک ویستبای کەرێتی بکا و لەدەرێ خۆی ڕەق بکاتەوە، ڕێگای بۆ ئاوەڵا بوو. هەر کەس هەوڵی دەدا دوا کەس پێ لە ڕاڕەوەکە بباتە دەرێ.

شۆخۆفیش وەختی دی بە دیوارەکەوە دەنووسا. بەڵام ئەو جارەیان یەکسەر ڕووی لە دەرێ کرد و بە لاقرتێوە گوتی: «لە چی دەترسن ناسک و نازدارینە؟ تا ئێستا لە سەرمای



سیبریا دا لە دەرەوە نەبوون؟ وەرنە دەرێ و بە هەتاوی گورگان خۆتان گەرم بکەنەوە... هۆ ئاپۆ، ئاگری جغارەکەت هێروە بەڕێ بکە.»

جغارەکەی هەڵکرد و پێی نایە سەر پلیکانەکان. هەتاوی گورگان لە زێدەکەی ئەو، ناوێک بوو لە مانگیان نابوو.

***

مانگ پتر هەڵکشابوو. بەرە بەرە دەگەیشتە ناوەندی ڕێگای هەموو شەوانی لە ئاسمان. ڕەنگی تۆخی ئاسمان مەیلەو یەشمی بوو. لێرەو لەوێ ئەستێرە دەبینران. بەفری سپی لەبەر تریفەی مانگەشەو دەبریسکا و دیواری خەوگەکانیش لەوە دەچوون ڕەنگیان چەرمگ بێ. ئێستا ئیتر تیشکی چراکانی ئۆردووگا چاویان شەوارە نەدەکرد.

بەر دەرکی یەکێ لە خەوگەکان بە ئاپۆرە ڕەش هەڵگەڕابوو. ئەفراد بۆ پشکنینی شەوانە ریز ببوون. خەوگەکانی دیکەش دەبوو بپشکێندرێن. هەموو لا کش و مات بوو، تەنیا کرپەی بەفری ژێر چەکمان دەهات.

پێنج زیندانی بە پلیکانەکانی خەوگەی ژمارە نۆدا داگەڕان. دوا بە دوای ئەوانیش سێ کەسی تر هاتنە دەرێ. شۆخۆف لەگەڵ ریزی دووەمی پاش پێنج کەسەکەدا بوو. زگی تێر و جغارەیەک بە لالێوەوە، ڕاوەستان لەوێ زۆریش ناخۆش نەبوو. تووتنەکەی، تووتنی چاک بوو. لاتڤییەکە درۆی لەگەڵ نەکردبوو. تووتنێکی نەرم و بۆنخۆشی دابۆیە.

هێندێک بەندیی دیکەش لە خەوگە هاتنە دەرێ و لە دوای شۆخۆف ریز بوون. ئەو زیندانییانەی هاتبوونە دەر، لە داخی ئەوانەی هێشتا لە ژوورەوە بوون وەخت بوو بدڕێن. دەبوو لەوێ چاوەڕێی ئەو سەگبابانە بکەن و لە سەرمان ڕەق هەڵێن.

***

زیندانییەکان هەرگیز سەیری کاتژمێریان نەدەکرد. کاتژمێریان بۆچی بوو؟ زەنگی لە خەو هەستان، سەرژمێری، پشوودانی فراڤین و زەنگی چرا کوژاندنەوەیان لێ زیاد بوو.

گوایە، پشکنینی شەوانە نزیکەی سەعات نۆ دەکرا. بێگومان تا سەعات نۆ لە کارەکانیان نەدەبوونەوە. تا دوو جار نەیانژماردبان لە کۆڵیان نەدەبوونەوە، جار هەبوو لە

دوو جاریش تێدەپەڕی. تا پێش سەعات دە، خەوتن مەحاڵ بوو، زەنگی بە ئاگاهێنانی بەیانییان، کاتژمێر پێنج لێدەدا. هیچ سەیر نەبوو مۆڵداوییەکە پێش تەواو بوونی کاری ڕۆژانە خەوی لێبکەوێ، زیندانی کە جێگایەکی گەرمی وەگیر دەکەوت، هەر زوو خەو دەیبردەوە. لە ماوەی حەفتەیەکدا هێندیان بێخەوی دەچێشت، یەکشەممان ئەگەر دەستیان بەتاڵ بوایە لە خەوگە دا وەک کەلاکان بەسەر یەکدا دەکەوتن.

***

ئێستا گشتی ڕژانە سەر پلیکانەکان. سەگبابی چاودێری خەوگە و ئەو پاسەوانە قوڕمساغانە بە شەق لە خەوگە وەدەریان نابوون.

ئەو زیندانییانەی لە دەرێ ڕیزیان گرتبوو بە سەریاندا قیژاندن:

«خۆتان پێ زرینگە، زۆڵینە، ها؟ بە تەمای چی هێندەتان خۆ گنخاند؟ ئەگەر زووتر هاتبان ئێستا دەچووینەوە ژوورێ.»

هەموویان هاتبوونە دەرێ. چوارسەد کەس بوون کە لە خەوگەیەکدا دەخەوتن. هەشتا ڕیزی پێنج کەسییان پێک هێنان. ڕیزەکانی پێشەوە ڕێک و پێک بوون، بەڵام ئەوانی دواوە هەر تێکەوەیان داویشت.

چاودێری خەوگە لەسەر پلیکانەکانەوە نەڕاندی: «ئەوانی دواوە، بە پێنج ڕیز!» بەڵام کێ گوێی دەدایە؟ هەی نەعلەتیان لێ، زۆڵینە!

سیزار بە بێحاڵی، لە کاتێکدا وای دەنواند نەخۆشە، لە خەوگە هاتە دەرێ و بەدوای ئەودا دوو خزمەتکاری قاوشەکەی تری خەوگە و خزمەتکارەکانی قاوشی خۆیان، لەگەڵ زیندانییەکی شەل گەیشتنە سەر پلیکانەکان. لەپێشەوەی ڕیزەکە جێگای سیزاریان کردەوە. شۆخۆف کەوتە ڕیزی سێیەم.

پاسەوانەکە هاتە سەر پلیکانەکان.

بە دەنگێکی بۆڕ بەسەر ئەوانی دواوەیدا نەڕاند: «بە پێنج ڕیز!»

چاودێرە ناجسنەکەش گوڕاندی: «بە پێنج ڕیز!» دەنگی ئەویش چەپێکی دە بەر دەنگی پاسەوانەکەدا نەبوو.



بەڵام ئەو زۆڵانەی دواوە هێشتا نەببوونە ڕیزی پێنج کەسی. چاودێری خەوگە لە پلیکانەکان دابەزی. چووە دواوەی ڕیزەکە و مشووری خواردن! چەند کەسی وەبەر شاپ و زللان دان. دیارە ئەویش پیاوی خۆی دەناسی. ئینجا کەسانی دواوە، ژیکەڵە، ڕیز بوون و ئەویش گەڕایەوە سەر پلیکانەکان و لەگەڵ پاسەوانەکەدا دەستیان بە ژماردن کرد.

کە ڕیزێکی پێنج کەسییان بانگ دەکرد، بە لەز خۆیان لە خەوگە داویشتەوە. ئیتر کەس کاری پێنەبوون.

بەڵام ئەوە کاتێک وابوو کە ژمارەکەیان ڕاست با. هەر شوانەوێڵەیەکی نەخوێندەوارت هێنابا، لەو جاشکەکەرانە باشتر دەیتوانی مەڕەکانی بە سەر بکاتەوە. ئەو لەوانەبوو نووسین و خوێندنەوە نەزانێ، بەڵام هەر بە قاڕاندنی پەزەکان دەیزانی تەواون یان نا. ئەو حەرامزادانە گەرچی پەروەردەش کرابوون، حیسێبی دووجار دوویان بۆ لێک نەدەبۆوە.

***

پار زستانێ، بۆ گەرم کردنەوەی چەکمەکانیان گەرمخانەیان نەبوو. شەو چەکمەکانیان لە خەوگە دادەنان. جاری وابوو چوار جار بۆ سەرژمێری دەیانبردنە دەرێ. ئەودەم وێ ڕانەدەگەیشتن جلەکانیشیان لەبەر بکەنەوە. پەتۆکانیان لە خۆیان وەردەپێچا و دەچوونە دەرێ. ئەوساڵ گەرمخانەیان دروست کرد. بەڵام جێگای چەکمەی هەموو ئەفرادی خەوگە نەدەبۆوە. هەر دەستەیەی بە سێ شەو جارێک گەرمخانەی وەبەر دەکەوت. ئێستا ئیتر بۆ سەرژمێریی دووبارەی ئەفراد لە خەوگە نەدەچوونە دەرێ. لە قاوشێکی خەوگەوە دەیانبردنە قاوشەکەی تر.

***

شۆخۆف یەکەم کەس نەهاتەوە خەوگە، بەڵام بە چوار چاو ئاگای لە ئەوانی دیکە بوو. یەکسەر بەرەو تەختی سیزار چوو و لەسەری دانیشت. چەکمەکانی داکەندن، وە سەر تەختێکی دیکەی نزیک سۆبەکە کەوت و چەکمەکانی لە سەر دانان تا وشک بینەوە. چەکمەی تری لێنەبوو. هاتەوە سەر تەختەکەی سیزار، چۆکی دادان، چاوێکی لە تەختەکە و یەکی لە چەکمەکانی بوو. بە دەنگی بەرز بە یەکێ لە زیندانییەکانی گوت: «هۆی، دەگەڵ تۆمە سەرسوور! چت بەو چەکمانە داوە؟ چەکمەکانی خۆت دابنێ و وە دوای کاری خۆت بکەوە.»

زیندانییەکان بە خەوگە وەربوونەوە. چەند کەسێکی دەستەی ژمارە بیست هەرایان کرد: «چەکمەکانتان بێنن با بیانبەینە گەرمخانە!»

دەیانهێشت چەکمەکان بەرنە دەرێ و دەرگەی خەوگە دابخەنەوە. پاشان کە دەگەڕانەوە تەقەی پێوەدانی دەرگای خەوگە دەهات.

«برادەر پاسەوان، دەرگاکە بکەوە!» بەڵام ئەودەم ئێشکگرەکان بە خۆو تەختە سێ توێیەکانیانەوە دەچوونە بارەگای فەرماندەیی و خەریکی لێکدانەوەی ئەرکەکانیان دەبوون.

شۆخۆف تازە پەکی بەهیچ نەدەکەوت. سیزار هاتەوە. گوتی: «سوپاس، ئیڤان دنیسۆڤیچ!»

شۆخۆف سەری لەقاند، وەک سمۆرە وەسەر تەختەکەی کەوت و لە جێگاکەی خۆیدا ڕاکشا. ئێستا دەیتوانی نانەکەی بخوا، جغارەیەک بکێشێ، یان بخەوێ.

ڕۆژێکی زۆر خۆشی بەسەر بردبوو و خەوی نەدەهات. دڵی خۆش بوو. ڕاخستنی جێ و بانەکەی زەحمەت نەبوو. تەنیا بەتانییە ڕەشەکەی بە دۆشەگەکە دادەدا. (دوایین جار کە لەسەر چەرچەف خەوتبوو، ساڵی چل، لە ماڵی خۆیان بوو. بیری لەوە کردەوە بۆچی ژن هێندە لەسەر ڕاخستنی چەرچەف مکووڕە؟ ڕاخستنی چەرچەف بێجگە لەوەی کاریان بۆ زیاد بکا، بەکاری چی دەهات؟) سەری وەسەر بالیفە بڕڕەکە کرد. لینگی لە قۆڵی کەوایەکەی کێشان و پاڵتۆکەی لەسەر پەتۆکەوە بەخۆی دادا. لە هەموو کارێک بیۆوە. ئەوەشیان ڕۆژێک بوو کە ڕابرد. لە بن لێوییەوە شوکری خوای بە جێ هێنا.

بەس نەبوو سەری لێرە دەنایە زەوی نەک لە ناو چوار دیواریی سلوولدا؟ ئەوە خۆی کەم نەبوو.

شۆخۆف ڕوو لە پەنجەرە خەوت. ئالیۆشا، سەراو قوونی ئەو، لەسەر تەختێکی تر خەوتبوو تا تیشکی چرای بۆ بێ. دیسان خەریکی خوێندنی ئینجیل بوو.

ئالیۆشا ورتە ورتەکەی شۆخۆفی گوێ لێبوو. ئاوڕی وێ دا و گوتی: «وانێکە، ئیڤان دنیسۆڤیچ، ڕۆحی تۆ پێویستی بە دوعایە، باشە بۆچی لە بارەگای باری تەعالا دوعا ناکەی؟»

شۆخۆف سەیری ئالیۆشای کرد. چاوی ئالیۆشا وەک گڕی دوو مۆم لە خەوگەی نیوە



تاریکدا داییسان. هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی دایەوە: «دەزانی بۆ، ئالیۆشا؟ لەبەرئەوەی ئەو دوعایانەش وەک گازندە کردنە لای کاربەدەستان، یان ناگاتە گوێی کەس، یان ئەگەر بشگا، دەڵێن کەس مافی گازندە کردنی نییە.»

لە پێش بارەگای فەرماندەیی چوار سندووقیان دانابوون و دەرگەیان بە لاک و مۆر گاڵە دابوون. مەئمووری ئاسایش هەموو مانگان بەتاڵیان دەکردن. زۆر زیندانی عەرزوحاڵی خۆیان لەو سندووقانە هاویشتبوون و هەتا یەک دوو مانگ لە چاوەڕوانی وەڵامدا ڕۆژیان ژماردبوون. بەڵام کەس وەڵامی نەدانەوە، یان گازندەکانیان ڕەت کرانەوە.

«ئیڤان دنیسۆڤیچ، گرفتی تۆ ئەوەیە بە دڵ دوعا ناکەی، بۆیە دوعاکانت قەبووڵ نابن. دەبێ بەردەوام دوعا بکەی، ئەودەم ئەگەر ئیمانت ساغ و پتەو بێ، دەتوانی کێو لە بن بێنی.»

شۆخۆف بە لاقرتێوە پێکەنی و جغارەیەکی بۆخۆی تێکرد. شخارتەی لە یەک لە ئوستوونییەکان وەرگرت.

«پێویست ناکا خوتبەم بۆ بخوێنی، ئالیۆشا. من قەت نەمدیوە هیچ کێوێک لە بن بێ، ڕاستییەکەی هەر کێوم نەدیوە. ئێوەی باپتیست لە قەوقاز ئەو هەموو دوعایەتان کرد، کێوێکتان پێ لە بن هات؟»

خەڵکێکی کۆڵەوار بوون. تەنیا کارێک لە دەستیان بێ، دوعا کردن بوو. هیچیشیان بە هیچ نەکردبوو. سەرو بیست و پێنج ساڵیان درابۆیە. بیست و پێنج ساڵ ئیتر ببووە حوکمێکی ئاسایی.

ئالیۆشا بە خۆو ئینجیلەکەیەوە چووە پەنا شۆخۆف و گوتی: «بەڵام خۆ ئێمە بۆ ئەوە دوعا ناکەین، ئیڤان دنیسۆڤیچ. خوا لەو دنیایەدا تەنیا بۆ یەک شت ئەمری بەئێمە فەرمووە دوعا بکەین، ئەویش بژێوی ژیانە. بینای چاوان! خۆت زەوادی ئەوڕۆمان بدەیە.»

شۆخۆف گوتی: «مەبەستت هەر ئەو جیرەی ڕۆژانەیە؟»

ئالیۆشا لەسەری ڕۆیی. چاوەکانی لە خۆی باشتر دەدوان. دەستی لەسەر دەستی شۆخۆف دانا: «ئیڤان دنیسۆڤیچ بۆ هەندێ خۆراک کە لە دەرێڕا یەکێک بینێرێ، یان بۆ قاپە

شێوێکی زیادە دوعا ناکا. شوورەییە پیاو بۆ ئەو شتە هیچوپووچانە لە دەرگای خواوەند بپاڕێتەوە. ئێمە دەبێ بۆ هاتنە دیی پێداویستییە رۆحییەکانمان دوعا بکەین. دوعا بکەین پەروەردگاری عیسا، دڵمان لە هەموو ژەنگ و ژوارێک پاک بکاتەوە.»

«ئەدی بۆچی قەشەی گوندەکەی ئێمە...»

ئالیۆشا لە کاتێکدا خۆی ڕێک دێنا، بە تکاوە گوتی:

«حەز ناکەم یەک وشەم لە بارەی ئەمەوە گوێ لێبێ.»

«نا تۆ گوێ بدەیە.» شۆخۆف ئانیشکی دایەوە، خۆی بە لای ئەودا شکاندەوە و لەسەری رۆیی: «قەشە، دەوڵەمەندترین کەسی گوندەکەمان بوو. ئەگەر یەکێک ویستبای بانی شیروانییی بۆ ماڵەکەی خۆی دروست بکا، سی روبڵی دەچوو، بەڵام بەلانی کەمەوە سەد روبڵمان لە قەشە دەستاند. ئەو قەشەیە بژێوی سێ ژنی، لە سێ شاران دەدا و چوارەم ژنی لە گوندەکەی ئێمە لە کن خۆی بوو. کاردینالیشی هەڵفریواندبوو. خۆزگە ئاگات لێبا چۆن سمێڵی ئەویش چەور دەکا. هەر قەشەیەکی دیکەش هاتبایە وێندەرێ، ئەو قەشەیە دەیرەتاند. نەیدەویست لە داهاتەکەی کەس بکاتە هاوبەشی خۆی.»

«تۆ بۆ باسی ئەو قەشەیە دەکەی؟ کڵێسەی ئۆرتۆدۆکس لە ئینجیل لای داوە. لەبەر ئەوەشە ئەوان ناگیرێن. ئیمانەکەیان لاواز بووە.»

شۆخۆف تێیەوە راما و مژێکی لە جغارەکەی دا. گوتی «ئالیۆشا». دەستی لە ژێر دەستی دەرێنا و دووکەڵی جغارەکەی لە دەموچاوی کرد و لەسەری رۆیی: «من نکوڵی لە هەبوونی خوا ناکەم. تێدەگەی؟ من بڕوام بە خوا هەیە. ئەمە بە جێگای خۆی، بەڵام بڕوام بە چیرۆکی بەهەشت و دۆزەخ نییە. ئاخر پیاو ئەو چیرۆکانەی بەهەشت و دۆزەخی چۆن بۆ قووت دەچن؟ ئەوەیان بە ئەقڵی مندا ناچێ.»

شۆخۆف هەستایەوە، چوارمەشقی دانیشت و سووتەکی جغارەکەی لە نێوان تەختەکەی و پەنجەرە وەراند. ئاگای لەوە بوو سووتەکی جغارەکەی بەسەر گەمیەواندا نەوەرێنێ. لە گژ فکران راچووبوو و ئیتر گوێی لە قسەکانی ئالیۆشا نەدەبوو. بە قەو گوتی: «باشە، تۆ ئەوەندی حەزت لێیە دوعا بکە، بەڵام ئەوە بزانە تاقە یەک رۆژیشت زیندان بۆ کەم نابێتەوە.»



ئالیۆشا بە حەپەسانەوە گوتی: «تۆ نابێ بۆ دەرباز بوون لێرە دوعا بکەی. ئازادیت بۆ چییە؟ لەدەرێ ئەوەندوسکە ئیمانەی هەشتە لەدەستی دەدەی. خۆش بە حاڵت کە لە گرتووخانەدای. ئێرە جێی مشتوماڵ کردنی رۆحە.

«پۆلسی پاقژ دەڵێ: بۆ دەگرین و دڵی من ئازار دەدەن؟ چونکە من لەتوانامدایە نەک هەر کۆت و سندم بکرێم، بەڵکو لە پێناوی ناوی خواوەندی عیسا دا بشمرم.» [١٥]

شۆخۆف چاوی لە ساپیتەکە بڕی و کڕ بوو. خۆشی نەیدەزانی ئاخۆ حەز دەکا ئازاد بکرێ یان نا؟

سەرەتا مەراقێکی زۆری بۆ ئازادی هەبوو. هەموو شەوێ ژمارەی رۆژە چووەکان و رۆژانی نەهاتووی رادەگرت. دوایە لەو کارە بێزار بوو. بە پێی رابردنی زەمان بۆی دەرکەوت ئەگەر رۆژێک لە رۆژان ئازادیش بکرێن، مەحاڵە بهێڵن بچنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. کێ دەڵێ ژیانی ئێرە لە چاو ژیانی گوندەکەیان سەد قات خۆشتر نابێ؟

بۆ ئەو، ئازادی تاقە مانایەکی هەبوو: گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی، کە ئەوەش مەحاڵ بوو.

ئالیۆشا درۆی نەدەکرد. لە تەرزی دوان و چاولێکردنیڕا پیاو گومانی نەدەما کە بەو زیندانی بوونەی خۆی دڵگران نییە.

شۆخۆف گوتی: «چاو ئالیۆشا، ئێرە بۆ تۆ چ عەیبی نییە. مەسیح رایسپاردووی بێیە ئێرە، تۆ لە پێناوی ئەودا لێرەی. ئەدی ئەمن لە سۆنگەی چییەوە لێرەم؟ لەبەر ئەوەی ئەوان ساڵی چل و یەک خۆیان بۆ جەنگ ئامادە نەکردبوو؟ سووچی من چییە؟»

***

کیلگاس لەسەر تەختی خۆیڕا بە دەنگی بەرز گوتی: «ئەوشۆ دەڵێی سەرژمێریی دووبارە، لە گۆڕێدا نییە.»

شۆخۆف گوتی: «ئەرێ، دەبێ کڵاومان هەڵاوێین نەیگرینەوە. شتی وا کەم هەڵدەکەوێ.»

باوێشکێکی هاتێ: «ئەوجار دەتوانین بنووین.»

خەوگە کشومات بوو، کەس متەقی نەدەکرد.

لەوکاتەدا گوێیان لە تەقەی قوفڵی دەرگەی دەرەوە بوو. ئەو دوو زیندانییەی چەکمەکانیان بردبوونە گەرمخانە، بە ڕاڕەوەکەدا بەغار خۆیان لە خەوگە هاویشتەوە و گوڕاندیان: «سەرژمێریی دووەم!»

ئێشکگرێکیش بە دووی ئەواندا هات و گوڕاندی: هەموو بچوونە قاوشەکەی تر!»

هەندێک چاویان لە بیرەخەو ڕۆچووبوو. بە پرتە پرت هەستان و چەکمەکانیان لە پێ کردن (پانتۆڵەکانیان قەت دانەدەکەندن. لە ژێر پەتۆدا مرۆ بە بێ پانتۆڵ ڕەق دەبۆوە.)

شۆخۆف گوتی: «لەو سەگبابانە!» بەڵام زۆر تووڕە نەببوو، چونکە هێشتا خەوی لێنەکەوتبوو.

سیزار هەستا و دوو کولیچە، دوو کڵۆ قەند و پارچە سۆسیسێکی دایە. شۆخۆف لەسەر تەختەکەیەوە سەری دانواند و گوتی: «سوپاس سیزار مارکۆڤیچ، تۆربەکەتم وێ بدە با لەبن دۆشەگەکەمی دابنێم.» (کەس دزی پێ لە تەختی سەرەوە نەدەکرا، جگە لەمە کێ خۆی لە تەختی شۆخۆف دەگەیاند؟)

سیزار تۆربە سپییەکەی خۆی وێ دا کە بە بەنێک زارکی بەستبوو. شۆخۆف لەژێر دۆشەگەکەی خۆی نا و ڕاوەستا تا زۆربەی زیندانییەکان چوونە ڕاڕەوەکە. ئێستا ناچار نەبوو چیدی بە پێی پەتی لەوێ بوەستێ. پاسەوانەکە بە سەریدا قیژاند:

«هۆی لەگەڵ تۆمە، کابرای قولینچکێ!»

شۆخۆف بە پێخواسی لە تەختەکەی هاتە خوارێ (چەکمە و پێپێچەکانی لەبەر سۆبە گەرم و وشک ببوونەوە، حەیفی دەهاتێ بیانهێنێ) تا ئێستا ئەو هەموو سۆڵەی بۆ خەڵکی دروست کردبوون، کەچی ئێستا دەبوو خۆی بە پێخواسی بڕوا. بەڵام فەرقی پێنەدەکرد. بەو شتانە ڕاهاتبوو، سەرژمێریش زۆری نەدەخایاند. بە ڕۆژ سۆڵیان بە هەر کەس دیتبا، لێیان دەستاند.

ئەفرادی ئەو دەستەیانەی چەکمەکانیان بردبوونە گەرمخانە بێخەم بوون. هێندێکیان سۆلیان لە پێدا بوون و هێندێکی دیکەیان بە پێی پەتی و بە پێپێچانەوە دەڕۆیشتن.



ئێشکگرەکە هاواری کرد: «خێرا بن!»

چاودێری خەوگەش هەروەتر، گوتی: سەرتان بۆ مەترەق دەخورێ، بۆگەنیوی چەپەڵ؟

هەموویان بردنە قاوشەکەی تر، ئەوانەی دوای هەمووان هاتبوون، دەبوو لە ڕاڕەوەکە ڕاوەستن. شۆخۆفیش لەوێ پاڵی وە دیوار دابوو و لە نزیک ئاودەستخانەکە ڕاوەستابوو. بەر پێی تەڕ بوو، لە دەرێڕا تەزوویەکی ساردی دەهات.

کە هەموو هاتن، چاودێری خەوگەو ئێشکگرەکە بۆ دواجار کەلێن و قوژبنەکانی خەوگە گەڕان تا دڵنیا بن کەس بەجێ نەماوە. کەسێک زیاد و کەم با تووشی دەردەسەر دەبوون و دەبوایە سەر لەنوێ بیانژمێرنەوە. هەموو پەنا و پەسیوەکانی خەوگەیان سەنگ و سووژن دان و هاتنەوە ڕاڕەوەکە.

«یەک، دوو، سێ، چوار...»

ئەمجار خێرا خێرا دەیانژماردن و دەیانناردنەوە ژوورێ. شۆخۆف هەژدەم کەس بوو. خۆی گەیاندەوە تەختەکەی. پێی لەسەر قەراغەکەی دانا و بە چاوترووکانێک سەرکەوت.

ئۆخەی! دیسانەوە لینگی لە قۆڵی کەوایەکەی کێشان و تێخزا. ئێستا ئیتر دەیتوانی بنوێ. زیندانییەکانی قاوشەکەی دیکەیان دەهێنانە قاوشی ئەوان. بەڵام کاریان بەوان نەبوو.

سیزار گەڕایەوە سەر جێی خۆی و شۆخۆف جۆڕکەکەی وێ دایەوە. ئالیۆشاش هاتەوە. هەمیشە هەوڵی دەدا دڵی خەڵک بەدەست بێنێ، بەڵام لەو کارەدا چی پێ نەدەبڕا.

شۆخۆف یەک لە کولیچەکانی بۆ ڕاگرت و گوتی: «ها، ئالیۆشا.» ئالیۆشا زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی: «سوپاست دەکەم، بەڵام خۆت هیچت بۆ نامێنێتەوە.»

«گوێ مەدەیە، بیخۆ»

ڕاستی دەکرد، بەڵام شۆخۆف بۆ حاڵی خۆی برژیو بوو. سۆسیسەکەی لە دەمی ناو هەر جووتی. تیەح، بەلەزەت بوو! چەند پڕ ئاو بوو! بیری کردەوە پاشماوەی خواردەمەنییەکان سبەی پێش سەرژمێری بخوا. ئەو بەتانییە یەکبەر و چڵکنەی بەسەر چاوان هەڵکێشا. ئیتر گوێی لە دەنگی زیندانییەکانی قاوشەکەی تری خەوگە نەدەبوو کە لە چاوەڕوانیی

سەرژمێریدا هاتبوونە دەوروبەری تەختەکانی ئەوان.

خەوی لێکەوت. دڵی چەند خۆش بوو. ئەورۆ لە پەستا خێری هاتبووە رێ. نەخرابووە سلوول. دەستەکەیان نەناردبووە کۆمەڵگەی ئیشتراکی، قاپێک شێوی زیادەی بۆ فراڤین دەست کەوتبوو. سەردەستە جیرەی چاکی بۆ دەستەبەر کردبوون. ئەو دیوارەی دایاننابوو بە دڵی بوو. تیخەڵە پۆڵایەکەیان لێ نەگرتبوو. سەری شەو سیزار لە خواردەمەنی بەشی دابوو. تووتنی کڕیبوو. ژانی پشتی هێدی ببوو. هیچ شتێک رۆژەکەی لێ تاڵ نەکردبوو و لەسەر یەک رۆژێکی خۆش بوو.

دەبوو سێ هەزار و شەشسەد و پەنجا و سێ رۆژی دیکەش لە زینداندا بەسەر بەرێ. وەک ئەمڕۆ، لە تاریک و روونی بەیانییەوە تا ماڵ نووستنان. ئەو سێ رۆژە زیادەیە هی ساڵە کەبیسەکان بوو.



## پەراوێزەکا

١- بەکارهێنانی وشەی «هاوڕێ» بۆ زیندانییانی ئۆردووگا یاساغ بوو.

٢- بەو زیندانییانەیان دەگوت کە پاشی بەرەڵلا کردن، لەبەر ئەوەی لە مافی هاووڵاتی بێبەش دەکران یان چونکە ماڵ و حاڵیان نەمابوو، نەدەگەڕانەوە زێدی خۆیان و ئەغڵەبە لە کارگەی بیناسازیی پەنا ئۆردووگاکان دەگیرسانەوە.

٣- ئوردووگایەکی قەراغ رووباری «بچوورا» لە باکووری رۆژئاوای رووسیا.

٤- ئۆردووگای تایبەت بەو ئۆردووگایانە دەگوترا کە حوکمی توندوتیژتریان لە هی ئۆردووگای ئاسایی بەسەردا زاڵ بوو.

٥- لاتڤیا: کۆماری لاتڤیا لە بەستێنی بالتیک.

٦- ڤۆلکۆڤی لە وشەی Volk بەمانای «گورگ»ەوە وەرگیراوە.

٧- Kasha: جۆرە دۆکولێوێکی رووسییە.

٨- Old Believers: گرووپێک لە کلێسەی ئۆرتۆدۆکس کە پەیڕەوەکانی ، دژی چاکسازیی ئایینی سەدەی حەڤدەیەم لە رووسیا بوون و تاقمەکەی هەم لە سەردەمی تزارەکان و هەم لەسەردەمی حکومەتی شۆراکاندا ئازار و ئەشکەنجە دران.

٩- ئەستیپان بەندرا، رێبەری پارتیزانە نەتەوەییەکانی ئۆکرانیای رۆژئاوا کە تا ساڵی ١٩٥٠ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی شەڕی دەکرد. بەندرا ساڵی ١٩٥٩ بە دەستی سیخوڕانی سۆڤیەت لە ئەڵمانیا تیرۆر کرا.

١٠-Kulak: بە زمانی رووسی مانای لەچەر و رژد دەدا، کە بە جووتبەندەکانیان دەگوت. لە زاراوەی بلشویکەکاندا بە مانای «سەرمایەداری لادێیی»یە. کوولاکەکان بە بەرنامەی ئیشتراکی کردنی کشتوکاڵ رەش بوونەوە.

١١- سێرگەیی مینۆرۆڤیچ (Kirov): کۆمیسێر لە شەڕی ناوخۆ، ساڵی ١٩٢٩ بوو بە سکرتێری یەکەمی حیزب لە لێنینگراد. راوێژکاری نزیکی ستالین، کە هەوڵی دەدا بە

هۆی نفووزی خۆی توندوتیژیی ئەو کەم بکاتەوە.

کـوژرانی کـیـرۆڤ لەسـاڵی ١٩٣٤، (هەڵمـەتی پاککردنەوە)ی ناوخـۆی حـیـزبی لێ کەوتەوە.

١٢- Vechorka Moskvas: ئێوارە رۆژنامەیەکی مۆسکۆ.

١٣- Zavadsky: یۆری زاڤادسکی، بەرهەمـهـێنی رووسی، ئەندامی شـانۆی هونەریی مۆسکۆ، شانۆی لەشکری سوور و شانۆی «سویت»ی شاری مۆسکۆ.

١٤- مەبەست ستالینە.

١٥- کتێبی پیرۆز، کردەی پێغەمبەران، بیست و یەکەم، ١٣



**سەرچاوەکان:**

١- ندیم الهاشم، مجلە؟ (پێم وایە گۆڤاری ئەلیف با-ی عێراقی سەرەتای حەفتایەکان بێت چونکە تەنیا ئەو پەڕەم دەست کەوتووە).

٢- سعید الغانم، ادب الرفض السوفیاتی، دار النهار للنشر، بیروت، ١٩٧٠.

٣- جریدة الجزیرة، ١٩٩٩/٧/٤ (لە ئینتەرنێت وەرگیراوە).

٤- کامەران قەرەداغی، التضامن، ١٩٨٤/٦/٩، العدد ٦١.

٥- سەرچاوەی ژمارە ١.

٦- شربل داغر، کل العرب، العدد ٧٣، الاربعاء کانون الثاني ١٩٨٤.

٧- هەمان سەرچاوە.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- سەرچاوەی ژمارە ٤.

١٠- سەرچاوەی ژمارە ١.

١١- الاسبوع العربي، ١٩٨٢/٥/١٧.

# فەرهەنگۆک

## ئـ

ئەوەندوسکە: ئەو برە کەمە

ئەختوچار: ئەوپەڕی هەوڵدان

ئەنگران: دەوڵەمەندبوونی لەناکاو

ئاوردوو: سووتەمەنی

ئەوهە: ئەو مرۆڤە، ئەو شتە، ئەمەیان

ئامباز بوون: ئانگژا بوون

ئێزینگ: دار بۆ سووتەمەنی

ئێروو: بژیو، زەواد

ئەنگۆرە: بوولێڵی ئێوارێ

ئاشتەبا: ماڵ و سامان

ئەسکیناس: پارەی کاغەزی

ئاوەو ئاو چوون: بە هیچ و خۆڕایی لە دەست چوون

ئەوچەل: ئەوجار

ئەننەهو: وەک بڵێی

ئیشتیا: حەز

## ب

بە خەتەر نەدان: قوتار نەدان، لە سەرەوە نەچوون

برووکە: کەمێک، نەختێک

باسریشک: بای سارد و سڕی زستان



بەرک: گیرفان

بووز خواردن: ڕێک کەوتن، بۆ گونجان

باڕن: با بە بەفرەوە

بەتاڵاندن: لەناو بردن

بە قۆنەقۆن: ئێجگار بە کاوەخۆ، کاری تەوەزەل

بۆ باگرتوو: بۆنی باگرتوو، گۆشت یان پەنیری رزیوی رووەو خرابوون

باڕێزە: هەڵوەرین بەدەم باوە

بەقەو: بە توندی

بە نەقە نەق: بەدەم کارەوە نەقاندن، بە دژواری، بە حاڵەحاڵ

بە قوونەوە: بە دانیشتنەوە

بە دەماخ: کەیف خۆش، شادومان

بلێت: بیتاقە، پەتە

بازرە بەستن: ڕاکردن، تێتەقاندن

بۆڕدان: بەزاندن، ڕەتاندن

بۆ تێچاندن: پێوەکردن، دووزمانی کردن بۆ گیران و تووشبوونی کەسێک

بیرەخەو: خەونووچکە، وێژینگ دان

برِە: نێوئاخنی بالیف و سەرین کە لە ئیسفەنجی هاڕاو و پەڕۆی ئەنجراو دروست دەکرێ، چەوەڵی مشار

بیئازموون: تاقی بکەنەوە

## پ

پێشاو: ئاودەسخانە

پێ قاڕبوون: دەعیە نەهێنان، فیزی کەسی قۆڕ دەماخ کە هەندێ کار لە ئاستی خۆیدا نەبینێ

پاتە: پێڵاوی لە جیر دروستکراو

پاشقول دان: گل دانەوە

پێک هەڵپرژان: بەشەڕ هاتن، ئانگژای یەکدی بوون

پزوو: بەفر کە بەهۆی بارنەوە لە هەندێ شوێن وەسەریەک هەڵدەدرێ

پاچ: کولێنگ

پیشان: کولێن بە هەڵمی داوەستاو

پانتۆڵ زەردکردن: کینایە لە تۆقین و زراو چوون

پشوو هەڵماڵان: پشووبڕ بوون

پانڕاکردن: ڕاخستن

پەل بوونەوە: پێکەنین لە رووی ساویلکەییەوە

## ت

توێژاڵ: توێخ، توێژ، چین

تاڵووکە: پەلە، لەز

تین پێو: ئامێری پێوانی گەرما و سەرما (دماسنج)

توڵە: توولە سەگ، گجوولە، گجووک، فەرخە، تووتکە

تەرح و دیدار: چروچاو، رەنگ و روخسار (لایەنی سلبی هەیە)

تاووبان: کەشوهەوا

تەشقەڵە: شەڕ پێ فرۆشتن، جلّغە لێگێران

تێشت: بەرچایی، ناشتا، نانی بەیانی

ترە کەڵەک: ساخڵەسەنی، هاکەزایی

تخوون کەوتن: نێزیک کەوتنەوە

تەرە تەر: قسەکردنی کەسێک کە زمانی دەگیرێ

تیخەڵە: ئاسنی تیژ

توغیان: هەرەتی لاوی



تک دان: هەدادان، سانەوە

تێتەقاندن: ڕاکردن و جێهێشتن

تێلەکە: کۆڵی دار یان گیاوگۆڵ

توولەک بوون: زەرد و لاواز و بنێس بوون بەهۆی نەخۆشییەوە (زیاتر بۆ سەگ)

تۆرەمە: نەژاد، بنەچەکە

تێلا: گۆپاڵ، مەترەق

توڵخانەوە: رزین و پێکداتەپین

تۆربە: کیسە، جۆرک، توورەکە

تەژە: مرۆی زۆر درێژ (لایەنی سلبی هەیە)

تخێڵ بوون: ڕاکشان، لەو گۆڕەی کەوتن (بۆ کەسی سەرخۆش یان زۆر شەکەت بەکاردێ)

تیرەگ: کۆڵەگە، عەموود

تلّتە: تلّپە، دەرمان چای هەڵچۆڕاو

## ج

جامین ویستن: خۆشویستن، حەز لە چارەکردن

جەنگە: باشترین کات

جلّغە لێگێران: تەشقەڵە پێکردن

جوابەجەنگی: بەگژداهاتنەوە، دەستەوەکەری بە پەیڤان

جۆرک: توورەکە، تۆربە

جیرە: بەشەخۆراک بەپێی پەتە

## چ

چاوسوور: پشتگیر، داشدار

چڵ دان: ژانی ناوە بە ناوە
چلومل: قیرسمیچ
چوخساندن: جێگیر کردن، دامەزراندن
چێشتەخەو: خەوی پاشنیوەڕۆ
چروچاو: دەموچاو، روخسار
چەرمگ: سپی
چرتە نەکردن: نەبزووتن، متەق نەکردن

## ح

حەوجێ: پێویستی

## خ

خۆ لە دەسک و بیورنان: خۆ ساز و تەیار کردن
خۆ کروشم هەڵێنان: خۆ رێک هێنان، هەڵکورمان
خووس: زوقم، سیخوار، کەڕەسیسە
خۆ لێگۆڕان: خۆ لەبیرکردن، قۆڕ دەماخ بوون
خرتە: دەنگی جووڵانەوەی مشک
خۆ تاس و لووس کردن: خۆ جوان کردن، خۆ تیفتیفەدان
خەونووچکە: وێژینگ دان، بیرەخەو
خۆگنخاندن: خۆ خافلاندن لە کاردا، دەغەڵی
خۆ مەلاس دان: خۆ مات کردن
خوێچێژ: تام کردنی چێشت بۆئەوەی لە تام و خوێی بگەی
خۆ پساندن: خۆ ماندووکردنی لە رادەبەدەر
خەیاڵ پلاو: خەیاڵی رەنگین و خاو



خەلستن: رزگار بوون، تێپەڕین
خاڵیگە: کەلەکە
خڕیلە: کورتە بنە، مرۆی قوڵە، کورتە بالا
خراپ تێکۆشین: خەیاڵ خاو بوون
خووگەمل: مل ئەستووری بێڕەزا
خەپلە: قەڵەو، گۆشتن
خەوگە: شوێنی حەوانەوەی سەرباز و دیل و قوتابی و...تاد.
خیگە: پێستی رۆن، (کینایە لە مرۆی قەڵە و هەڵمساو)
خەدەنگ: رمب (کینایە لە بەژنی قیت و قنج)
خێو: خاوەن، خودان

## د

دەست بەئاو گەیاندن: چوونە ئاودەسخانە
دەستەک: زەنبەڵ
دایقەڵاشت: باریکەی دایە، فیزماڵکی دایە، رایکرد
دەمەلاسکە: لاسایی
دڵ دەخێڵەوە هاتن: دڵ تێکەڵ هاتن، هێڵنج دان
دین لە کن خۆ نەمان: دەهری بوون، تا ئەوپەڕ تووڕە بوون
دەم لە دەم نان: دەمەقاڵەکردن، شەڕەچەقە
دەمولەوس: دەم و لووت، زارو لێو (باری سلبی هەیە)
دم بەردووکە: خۆ لە کاران هەڵقوتێن و فزوول
دەرهەڵبوون: لێتووڕە بوون، بەگژ کەسێکدا هاتن
دەهری بوون: تووڕە بوون
دەستی سەگ گەستن: کینایە لەوپەڕی تووڕە بوون
داکوتان: دانیشتنی زۆری میوان و موسافیر (دەبێ لە داکوتانی سنگ و بەستنەوەی

ولاخەوە هاتبێ)

دەوید: گەواد

دەست هەڵێنە: پەلە بکە (لەکارکردندا)

دەیئاژۆت: لێی دەخوڕی، دەیئاژوا

داخنی: دەئاخنی

داشدار: پشتگیر، چاوسوور

داشقە: عارەبانە

داربەست: ئەسکەلە

دڕ: زوور، گڕنی، زبر

## ر

رێهالاندن: تێگرتن

رەشەولاخ: گیانلەبەرانی بەرزەی ماڵی وەکو: مانگا و گامێش

راباردن: رابواردن، تێپەڕکردن

رەپێچەک دان: راپێچ کردن، قوڵەپێچ کردن

رەژی: رەژوو، زوخاڵ

رەشتاڵە: رەنگ ئەسمەر، گەندومی

راستەوپاستە: رێک و پێک کردن

رەپاڵ نان: پاڵ پێوەنان

راوێچکە کردن: هاتن و چوونی بە پەلە

رەوەدە: ڕەوە، مێگەل

رەزگ نان: تێئاخنین، بردنە ژوورەوەی بە خورتی

رەتاندن: لە مەیدان بردنە دەر، بۆڕدان

رەش بوونەوە: لەناوچوون بە جارێ، ئاسەوار نەمان

رنەک: ئامرازی خوراندنی ئەسپ و خاوێن کردنەوەی شتی زبر، چۆرکە



## ز

زارک: سەری توورەکە، دەرگای ئەشکەوت و کونی دەعبایان

زەلین: زۆر خووسان بە ئاو

زەند: بەلەک

زیواڵ: تیتۆڵ، پارچەی پەڕۆ یان گۆشت

زەواد: قووت، بژێوی

زەڕ: زیان، زەرەر

زیروح: گیانلەبەر، زیندەوار

زەنبەڵ: ئامرازی کێشانی خەفتە و چیمەنتۆکە چوار دەسکی هەن و بە دوو کەسان هەڵدەگیرێ.

زاخە: ژووری بن عەرزکراو بۆ کاروباری سەربازی

زلحۆرت: گێژ و وێژی زەبەلاح

زمان لێدان: فریودان، کەرکردن

## ژ

ژوار: ژەنگ

## س

ساو: ساماڵ

سەرو بەر کردن: پەیداکردن

سەولە: نانی سەگان (سەولە برژاندن: کینایە لە خۆشیرین کردن و پان کردنەوە، کاتێ سەگ لە بەردەم نانکەردا کلکەسووتە دەکا تا سەولەیەکی بۆ ببرژێنێ).

سیلە: سووچ، گۆشە

سەکەت بوون: تۆپین

سەنگ و سووژن دان: گەڕان و پشکنینی بە وردی

سوار: لەسەر پێ (بۆ چەک)

سۆبە: زۆپا

سان: ڕێژە

سرت و خورت: چپە، فسکەفسک

سرسڕخانە: ماڵی ساردو سڕ

سێسەرە هەڵنەگرتن: چاوەدێری کردنی بە مکوڕی

سەبیلە: پایپ

سۆزی: سبەی

سڕو سیپاڵ: شڕە و بڕەی ناوماڵ، کەلوپەل

سەر پێوە نەبوون: کینایە لەوپەڕی ئەمەگداری و لە خزمەتدا بوون، مل لە موو باریکتر بوون

سووڕ: نۆرە، دەور

سەراونخوون: لینگەوقووچ، سەراوبن

سوونەوە: خشاندنی هەسان لە چەقۆ

سوورکارە: سوورفل

سوێ بوونەوە: دڵ تۆقین لە مەرەقان

سلوول: زیندانی تاکەکەسی

سۆدرە: زۆرزان و پیتۆڵ

## ش

شێوە: روخسار

شمەک: جلوبەرگ



شێوەلاک: شەویلک

شڕەخۆر: کەسێک کە لە شتی بەلاش دەگەڕێ

شاقەل: ئاتەگ، داوێنی کەوا و عەبا

شلکێنە: چێشتێکی شل و بەئاو

شەکر شکاندن: فەرمایشت فەرموون!

شتاق: هیچکام

شێف: ژەمی شەو

شلێپیتاو: خۆراکی ئاوەکیی بێتام

شرت و گوم: شوێن بزر، ون

شفتە: خەفتە، خەبتە

## ع

عەلەم: دەرد و ئازار

## غ

غوڕابی: پسکیت

## ف

فلێتەفلێت: کینایە لە چەنەبازی و کردنی قسەی قۆڕ

فراڤین: نیمەڕۆژە، ژەمی نیوەڕۆ

فەتیر: هەویری هەڵنەهاتوو

فل بوون: کۆڵ دان، بەزین، وەستان

فرۆتن: فرۆشتن

فیتفیتە: فیکە

## ق

قم: نوقم

قالب: لەش

قەیسەرخانە: جێگای زۆر سارد

قارک: لاسکی گیا

قەڵەمباز: بازی گەورە دان، لۆقاوی درێژ

قۆڕدەماخ: لە خۆبایی، دەمارزل

قەپاڵتە: قەپ، گاز

قاچاندن: دزین و سەرپۆش کردنی

قوون نەبوون: زات نەبوون، نەوێران

قوڵە: کورت

قەبرغە: لاتەنیشت، پەراسوو

قوونە دزە: فیزماڵک، بەدزیەوە رۆیشتن

قاورمە: گۆشتی سوورکراوە کە بشمێنێتەوە خرا نەبێ

قر و قەپ: بێدەنگ بوون، کڕ و کپ، قەلاقووپ

قڕە: کێشە و هەرا

قولینچک: قوژبن

قەڵت و بڕ: لەت و پەت کردن

قەبەزە: قەفەزە، بڕبڕەی پشت

قورمساغ: ژن حیز، گەواد

قوون هەڵدڕان: کینایە لە شەکەتیی زۆر و بەهرەی کەم

قەڵشین: شەق بردن، لەت بوون

قومقومە: مەتارە

قەلانگ: ئامرازی دەردانی مشکی و پۆلوو لە زۆپا (قەلانگی: وەک قەلانگ)



قەڵەمبڕ: چەقۆی بچووکی گیرفان

## ک

کۆل: تەشتی لە داری

کوشاد: بەرین، هەراو، فرەوان

کەمرە: ریخ و کشپلی ماڵات کە دەپەسترێتەوە

کرپە: دەنگی پێ لە بەفر نان

کەوڵ گروون: پێست خۆش کردن

کۆڵەمست: نەقورچ، مشتەکۆڵە

کەندر: پەت، تەناف

کۆزیلکە کردن: لە دەوری یەکدی کۆبوونەوە

کاوەخۆ: بەشێنەیی، لەسەرەخۆ

کوڕەگوێ: راکردن بە ترسەوە

کەڕەسیسە: زوقم، سیخوار

کەشەف: سینی

## گ

گن: کەسێک کە بە لووتی قسە دەکا

گۆرین: تاین، نێوبراو

گڕیشە: تەشقەڵە، تیتاڵ تێئالاندن

گێژەو پێکردن: هەڵسووڕاندن، چەرخ و خول پێدان

گێچەڵ: تەشقەڵە

گون پێنەچوون: کینایە لە پەک پێنەکەوتن

گوێ قولاغ: بەرئەمر و گوێ ڕایەڵی زیت

گڕوێ: ئابڵە

گووپ: بن کولّمه، لایەکی دەم کە فوو دەدرێ
گوڕاندن: نەڕاندن، قسەکردنی بەدەم هاوار و تووڕەیی
گاڵەدان: داخستن، قەپات کردن
گێڕ: شەل و سەقەت، قوون خوار
گڕنی: زبر
گورگە لۆقە: راکردن بە دەم هەڵاویشتنەوە
گروبان: عەریف، دەرەجەدار

## ل

لێس دان: لستنەوە، تەواوکردنی خواردنی ناو هیربار، ماشتنەوە
لە ژێڵڵا: لە ژێرڕا، لە خوارێڕا
لیژە: لەسەریەک هەڵچنراو وەکو لیژەی داران
لابڕ: ناوقەدبڕ
لرف دان: هەڵلووشین و ماشتنەوەی خۆراک
لاچەپ: لاتەریک، شوێنی بەتاقەوە کە بەدانستە بۆی بچی
لاکێش: جغارەکێشێک کە پارە بە جگەرە نادا و لەم و لەو وەردەگرێ
لە قەوچ دان: لە دەم راکێشان، دەمکوت کردن
لێهاڵانەوە: پێچ کردنەوە، بادانەوە بە دەوری بینا یان چیایەکدا
لاتەولات: خوار (مورب)
لەچەر: چاوچنۆک، رژد، چرووک، قڕنیس
لە حەندە حەندی: لەکاتی، لە جەنگەی
لێی وەبڕە: لێی ببڕەوە، وست بە
لینگ: تاک (لینگە دەستکێش: تاکی دەستکێش)
لوێچ: قووڵایی بەری دەست
لەخۆ نووسان: تانووت لێدان، زۆر لەخۆکردن



لۆقاو: هەنگاوی بەرز

## م

مردەلۆخ: پیاوی پووخن و نابووت
ماڵخۆ: خاوەن، ساحێب
مەگیرانی: بێزوو، تامەزرۆیی ژنی دووگیان
مەشرەف خۆش: سەرو رووخۆش، ئێسک سووک
مزە: هەقدەست
مرشتەکردن: لێک خڕبوونەوەی ماسییان
ملە: رکابەری، مونافەسە
مەترەق: گۆپاڵ، گورز، داردەست
ماڕز: بەرازی نێر
مێژۆک: بەرخ کە تازە لە دایکی بەر دەبێتەوە

## ن

نەوس: حەز، نەفس
نەقوستان: سەقەت، ئیفلیج
نەحەجمان: هەدانەدان، نەحاوانەوە
نەخوازەڵا: چ جای ئەوە، نمازە
نەمر نەژی: مەمرە و مەژی
نانی من پێ: لەکاتێکدا نانەکەی منی پێبوو
نەڕاندن: گوڕاندن، بە قەڵسی و بە قەو قسەکردن

## و

وەرگێڕکە: بەردەست، شاگرد

ودوده: بکەری کاری ورد و خێرا
وەعزدادان: خوتبە خوێندنەوە
ورتە ورت: دوان لەبەرخۆوە
وەزگ دان: دڵ تۆقین، مردن لە داخان
وانێک: هێن، ئەوە، نێوپڕی وشان

## هـ

هەڕناهووت: بۆگەن، بۆدڕن
هەڵقەنا: هەڵقەندرا، وەڕێکەوت (لەم ڕۆمانەدا)
هەڵاییسان: داگیرسان
هەو: وشەی سەرسوڕمانە، کاتێک کەسی بەردەنگ دەرفەتی قسەی بە زەبر بۆ کەسی یەکەم دەڕەخسێنێ، ئەو وشەیە دەبێتە سەرەتای ڕستە.
هڕەی لە بڕە نەدەکردەوە: هیچی لە هیچ نەدەزانی
هەسان: بەردی تایبەتی تیژکردنەوەی چەقۆ و شتی لەو بابەتە
هێروە: بۆ ئێرە
هەتڵە بوون: لێتێپەڕین، لێڕەت بوون
هەهانێ: وشەی نیشاندان بۆ دوور
هەنگڵەشەلە: قاچێک بەرزکردنەوە و بە قاچێک ڕۆیشتن
هەترەش: زەندەق، زراو

---

## نووسەری ئەم رۆمانە کێیە؟

**ئامادەکردنی: سالار عەبدولڕەحمان**

ئەلیسکاندەر سۆلژنیتسین لە یازدەی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران لە دایک بووە. خەڵاتی زانستەکانی لە زانکۆی روستۆف وەرگرتووە. لە حەوتی تەمووزی ١٩٤٥ و کاتێک نەقیبی کەتیبەیەکی تۆپهاوێژ بوو، بە تۆمەتی ناشیرین کردنی ناوبانگی ستالین، بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەندکراوە.[١]

سۆلژنیتسین یەکێکە لەو نووسەرانەی کە لە ئەدەبی سۆڤیەتی جاران بە هەڵگەڕاو (منشق) دەژمێردرێت. وەک دەزانین هەڵگەڕاوەکان پایەیەکی بڵند و دیاریان لە ناوەندی ئەدەبی سۆڤیەتی و جیهانی بۆ خۆیان دابین کرد. چوار لەو پێنج نووسەرە سۆڤیەتییانەی خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت (ئیڤان بونین ١٩٣٣، بۆریس پاسترناک ١٩٥٨، ئەلیکساندەر سۆلژنیتسین ١٩٧٠، جۆزیف بروودسکی ١٩٨٧) لە هەڵگەڕاوەکان بوون. هەر بەتەنیا میخائیل شۆلۆخۆف لەگەڵ دەسەڵاتدا بێ کێشە و دەتوانین بڵێین کۆک بوو.

نزیکەی سێ چارەگە سەدەی دەسەڵاتی کۆمۆنیستی لە سۆڤیەتی جاران، سەردەمێکی تژی لە هەراوهۆریا و ستەم و چەوساندنەوەی میللەتانی خۆیان و دەوروبەریش بوو. تەنانەت پریشکی ئەو ئاگرە بێ ئامانە بەر میللەتی کوردیش کەوت. بێجگە لە کوردەکانی سۆڤیەت کە پەرشوبڵاوی چەندین کۆمار کران، کۆماری کوردستان لە مەهاباد بووە قوربانیی ئەو سیاسەتە چەوت و چەوێڵەی ستالینی خوێنڕێژ و دژ بە مرۆڤایەتی. بە دەست لە پشت دانی ستالین، ئەندرێ ژدانۆڤ لە کۆنگرەی یەکەمی نووسەرانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٣٢ بووە داڕێژەری دەستەواژەی «هونەر بۆ ژیان». ئەوەش بەو مەغزایە کرا تا هەموو شتێک لە قاڵب دەن، ئەوە بوو ریالیزمی سۆشیالیستیان کردە مۆتەکەی سەر سنگی ئەدەب، ئەوەش بووە هۆی هاتنەکایەی «پاڵەوانی پۆزەتیڤ».

هەر لەبەر ئەم جۆرە ئەدەبەی کە دەبا بە گەشی و بێخەوشی و ئازایی پاڵەوانی کرێکاری و کۆمۆنیستیدا هەڵبڵێن و نووسەرانیش لەو جەغزە دەرنەچن. ئەوانەی پابەندی ئەو جۆرە



شێوازە بوون هەر لە بەراییدا ئەدەبێکی مردووی بێ کەڵکیان بەرهەم هانی. سەدان و بگرە هەزاران شیعر و چیرۆک و رۆمان و شانۆ و فیلم و چی و چی دیکەیان نووسی، بەڵام کوا کاریگەرییان لەسەر رەوتی ژیانی مرۆڤ؟ کوا شوێن پەنجەیان بە سەر ئەدەب و هونەر و...تادەوە؟

کەچی لە بەرامبەر ئەمانەدا کەسانێک هەبوون مەردانە بەرەنگاری ئەو سیاسەتە چەوتە بوونەوە کە بە هەڵگەڕاوەکان بەناوبانگ بوون. کەسانی هەرە دیاریان ئەوانە بوون: «ئانا ئەخماتۆڤا، ئۆسیپ ماندەلشتام، بۆریس پاسترناک، سۆلژنیتسین، سینیافسکی، ئەناتۆلی ریباکۆڤ، جۆزیف بروودسکی، فۆزنیسنسکی، بوکۆفسکی، دانییێل، لیدیا شکۆفسکایا، ئیرینا راتوشتنسکایا و... تاد» کە هەر یەکەیان بەجۆرێک لە جۆرەکان بوونەتە قوربانیی دەستی ژدانۆڤیزم لە ئەدەبدا.

ساڵی ١٩٥٣ کاتێک ستالین مرد، خرۆشۆف بووە گەورەی سۆڤیەتستان. خرۆشۆف لە کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا ستالین و ستالینیزمی تاوانبار کرد و هەوڵیدا جۆرە ئارامییەک بێنێتەکایە، رێگەی بڵاوبوونەوەی هەندێک لەو نووسینانەی دا کە سەردەمی ستالینیان بە سەردەمێکی رەش و پڕ ترس و تۆقین نیشان دەدا. یەکێک لەو کتێبانە کە بە یارمەتیی خرۆشۆف لە سۆڤیەت دەرچوو، ئەو رۆمانەی سۆلژنیتسین «رۆژێک لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ» بوو کە لە ساڵی ١٩٦٢دا بڵاوبۆوە و سەدایەکی زۆری هەبوو[٢]. هەرچەندە پێشتر ئەم رۆمانە وەکو سامیزدات (لە رووسیا بە نووسراوەی دوور لە سانسۆر دەڵێن) و بەشێوەی نهێنی و دوور لە چاوی دەسەڵات ئاشنای خەڵکی ببوو و بەتاسەوە دەیانخوێندەوە.

لە سەرەتای حەفتاکاندا «نینا پیترۆڤنا»ی هاوسەری خرۆشۆف خوێندنەوەی رۆمانەکەی پێ تەواو نەکرا و گوتی: «ئەگەر ئەو قسانە راست بن و ئەم رۆمانە واقیعی ئەو سەردەمەمان نیشان بدات، ئەدی چۆن ئێمە تا ئێستا لە ژیاندا ماوین؟[٣]

بەڵام خرۆشۆف هەر بەمەوە نەوەستا، کاتێک سۆلژنیتسین نیازمەندیی خۆی بۆ نووسینی رۆمانێکی دیکەی سەردەمی گرتن و کوشتنی فەرمانڕەوایی ستالین دەربڕی، فەرمانی دا دەرگای نهێنیترین ئەرشیڤخانەی بۆ بخرێتە سەر گازەرای پشت[٤]. لەبەر رۆشنایی ئەو دیکۆمێنتانە رۆمانی «ئەرخەبیلی کۆلاگ»ی نووسی. دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت دوایی

زانیان خرۆشۆف چ هەڵەیەکی مەزنی کردووە. لەبەر هەندێ هەندێک کەس سۆلژنیتسین بە دەرهاویشتەی سەردەمی کرانەوەی خرۆشۆف دادەنێن. هەر بۆیەش سۆلژنیتسین لە ڕێوڕەسمی ناشتنی خرۆشۆفدا بەشداری کرد و وەک وەفایەک بۆ یارمەتییەکانی، گوڵێکی سووری لەسەر گۆڕی دانا.

سۆلژنیتسین لە ژیانیدا دەرد و مەینەتیی زۆری چەشتبوو، ساڵی ١٩٧٠ کە خەڵاتی نۆبڵی درایێ لێیان پرسی ئاواتت چییە؟ ئەویش لە وەڵامێکی زۆر سادە و سەیردا گوتی: ئاواتم ئەوەیە کاتێک پیر دەبم و ددانەکانم دەکەون، نزیکەی ڕۆژێکی تەواو بە دڵشادی لەناو بەلەمێکدا بەرمە سەر.[٥]

دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت ساڵی ١٩٧٤و پاش ئەوەی بە خاین ناودێریان کرد و دەیان ناو و ناتۆرەی سووکی دیکەیان لێنا، ڕێگەیان دا لە سۆڤیەت بچێتە دەرەوە. ماوەیەک لە سویسرا مایەوە و پاشان گوندی کاندیشی سەر بە ویلایەتی فیرمۆنتی ئەمەریکا و لە پەڕگەی گوندی، بە پارەی خەڵات و داهاتی نووسینەکانی بیست هێکتار زەوی کڕی و خانوویەکی لەسەر دروست کرد و ئەو گوندە دوورە دەستەی وەکو جێگای ژیانی خۆی هەڵبژارد، چونکە دارستان و چیا پڕ بەفرەکانی هەر لە وڵاتەکەی خۆی، لە رووسیای دەکرد. لە لایەکی دیکەوە هەمیشە دوور لە چاوی کامێرا و ڕۆژنامە و تەلەڤزیۆنان سەرقاڵی نووسینی بەردەوام بوو. لەو شوێنەدا، ڕۆمانی «ڕەوڕەوەی سوور»ی نووسی کە باسی مێژووی شۆڕشی رووسیای تێدا کرد و لە مێژووی ڕۆماننووسیندا بە درێژترین ڕۆمان دادەنرێت، چونکە لە بیست گرێ پێکدێت و تەنیا گرێی یەکەمی چاپی یەکەمی بە زمانی فەڕەنسی ٩٠٨ لاپەڕەی قەبارە گەورە بوو. تا ئێستا دوو بەشی ئەو ڕۆمانەی بە زمانی رووسی بڵاو کردووەتەوە.[٦]

سۆلژنیتسین لە کاتی نووسینی ئەم ڕۆمانەیدا شەو و ڕۆژ نزیکەی حەڤدە کاتژمێر، شێتانە کاری دەکرد، ئەرشیڤێکی گەلێ دەوڵەمەندی کۆکردبووەوە، بێجگە لە ژنەکەی و خەسووی و هەر سێ کوڕەکەی[٧]، کەسانێکی زۆری هەڵگەڕاوە لە سۆڤیەت و بە تایبەتیش ئەوانەی لە تاراوگە دەژیان یارمەتییان دەدا.[٨]

ساڵی١٩٩٠ ڕەگەزنامەی رووسیان پێدایەوە و ڕێز (اعتبار)یشیان بۆ گێڕایەوە، ساڵی ١٩٩٤ بە یەکجاری گەڕایەوە رووسیا، ماوەیەک بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی پێشکەش



دەکرد، پاشان وازی هێنا.

نموونەی باڵا و بەرچاوی لە ژیان و نووسیندا تۆلستۆیە و زۆر پێی سەرسامە، تەنانەت لە هەندێ کاری ڕۆژانەی لە دوورە وڵاتی لاسایی ئەوی دەکردەوە.

سارتەر دوای خوێندنەوەی «ڕۆژێک لە تەمەنی...» گوتی: «ئەوە گرنگترین کارێکی ئەدەبی هاوچەرخی سۆڤیەتییە»[٩].

ڤیکتۆر نیکراسۆف لە کییێفی پایتەختی ئۆکرانیا هەڵسایە سەرپێ و گوتی: «پێم بڵێن یەکێک لە مەزنترین نووسەران کە ناوی سۆلژنیتسین-ە لێرەیە؟» لەو کاتەشدا ئەندرێ فۆزنیسنسکی لە یەکێتی نووسەرانی سۆڤیەت هەڵسایە سەر پێ و گوتی: «بەڵێ، سۆلژنیتسین لە هەمووان مەزنترە»[١٠].

سۆلژنیتسین خاوەنی یادەوەرییەکی زۆر بەهێز و سەیرە. تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە، تەمەنی هەشتاو حەوت ساڵە و هەر لە رووسیا دەژی. هەندێک لە بەرهەمە دیارەکانی ئەمانەن:

١- ڕۆژێک لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ

٢- ئەرخەبیلی کۆڵاک

٣- بەشی شێرپەنجە

٤- بازنەی یەکەم

٥- رووسیا لە دۆزەخدایە

٦- ڕەوڕەوەی سوور

**سوپاس:**

*** بۆ سالار عەبدولڕەحمان-ی هاوڕێ و چیرۆکنووس و ئاشقی سۆلژنیتسین کە غیرەتی ئەو کارەی وەبەر نام.**

*** بۆ شاناز-ی هاوسەر و خەمخۆرم کە لە نزیک خۆم زۆری تەنیایی چێشت تا ئەو ئەرکە ڕاپەڕی.**

**-وەرگێڕ-**